# سیواک

## له نێوان سوننه ت و زانستی تاقیکردنه وه یی نوێدا

ـ ـ ـی

د. کمال علی أحمد

ستاله زانکۆی ئه زهه ر

ه رگێڕانی

أحمد محمد قرنی

| | |
|---|---|
| نـــــــــاوی کتێـــــــب: | سیواك لەنێوان سوننەت و زانستی تاقیکردنەوەیی نوێدا |
| نـــــــــــــــــووسینی: | م.د.کمال علی أحمد |
| وەرگێـــــــــــــــڕانی: | أحمد محمد قرنی |
| نـەخشەســـــــــازی نـاوەوە: | کومپیوتەر (کـامران رفیق) |
| ســـــــالی چـــــاپ: | یەکـــــــــەم ٢٠١٣ز |
| ژمـــــــارەی سپـــــاردن: | (١٩٨٤)ی سـالی (٢٠١٣)ی پێدراوە |

# سیواك

## لەنێوان سوننەت و زانستی تاقیکردنەوەیی نوێدا


نووسینی

م.د.كمال علی أحمد

مامۆستا لەزانکۆی ئەزهەر


وەرگێڕانی

أحمد محمد قرنی

## بسم الله الرحمن الرحيم

خوای گەورە دەفەرموێ:﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ﴾. (سورة الحشر: ئایەتی:٧)

واتا: ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) بۆی هێناون وەری گرن‌و جێبەجێی کەن، ئەوەشی ڕێگەی لێ گرتوون، مەیکەن.

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (( السوّاكُ مَطْهرَةٌ لِلفَمْ مَرْضاةٌ للرَّب)) بوخاری بە هەڵواسراوی گێڕاویەتیەوەو نەسائی گەیاندویەتی بەسەرەوەی خۆیان ئیبن‌وماجەو دارەمی‌و أحمدو ئەوانی تر بە سەنەدی ڕاست.

## دەسپێك

إن الحمد لله نحمده و نستعينه و نستهديه و نستغفره و نعوذ بالله من شرور أنفسنا و سيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له، و من يضلل فلا هادي له، و أشهد أن لاإله إلاّ الله وحده لا شريك له، أشهد أن محمداً عبده و رسوله ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ﴾ (آل عمران:١٠٢).

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا﴾ (النساء:١).

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا﴾ (الأحزاب:٧٠-٧١).[١]

---

[١] ئەو پێشەکیە پێی دەڵێن: (خطبة الحاجة) واتە ووتاری پێویست، پێغەمبەر (ﷺ) یاوەرانی فێر دەکرد پێش وتارو قسە کردن بیڵێن، لە کاروباری ئایینیان، جا ووتاری هەینی بوایە یان ژن مارەکردن یان هی تر. فەرموودەکەش ئەبوداود لە کتێبی (النكاح) (باب)ی (خطبة النكاح) (٢/٢٤٥) بە ژمارە (٢١١٨) گێڕاویەتیەوە. ترمذی لە (كتاب النكاح) لە (باب ما جاء في خطبة النكاح) (٣/٤١٣) ژمارە (١١٠٥)، گێڕاپتیەوە. گوتی: فەرموودەی عەبدوڵای کوڕی مەسعود فەرموودەیەکی (حسن)ە دوایی دوو ڕێی

## پاشان:

ئیسلام وەك ئەوەی پێغەمبەری نازدار هێناویەتی (ﷺ) دینو دونیایە، ئەوجا بەخشەرێکی شارستانی نوێیە، پێش زەمانی خۆی کەوتۆتەوە بە چەند سەدەیەك، لە هەموو چاخێکدا پڕشنگ دەداتە عەقڵی مرۆڤایەتی، پڕشنگی ڕوونو ڕێنیشاندەر، عەقلی دوورو نزیکی پێ سەرسام دەبێو سینگی ئیماندارانی پێ سارد دەبێتەوە، ها ئێستا ئەمڕۆ ئێمە لە خزمەت یەکێك لەو پڕشنگە موعجیزە ئاسایەین:- بەڵێ (سیواك) دیاریەکی ئیسلامی تەندروستی یە بۆ خەڵکیو بێ شك موعجیزەیەکی تەندروستی یە خوای گەورە ویستی وا بووە لە پاش هەزارو چوار سەد ساڵ بتەقێتەوە لە فەرموودەی

---

دیکەی باس کردووە لەو فەرمووی هەردوو فەرموودەکە ڕاستن (صحيح)ن. نەسائیش لە کتابی (النكاح) بەشی (ما يستحب من الكلام عند النكاح) (٨٩/٦)و عبدالرزاق لە (المصنف) کتابی (النكاح) بەشی (باب القول عند النكاح) (١٨٧/٦) ژمارە (١٠٤٤٩)و طبراني لە (العجم الكبير) (١٢١/١٠-١٢٢) ژمارە (١٠٠٨٠)، حاكم لە (المستدرك) (١٨٢/٢-١٨٣)، ئەو لەگەڵ (الذهبي) لێی بێدەنگ بوون بيهقی لە (السنن الكبرى) کتابی (النكاح) بەشی (ما جاء في خطبة النكاح) (١٤٦/٧) هەر هەموویان لە (حديث)ی عبدالله ی کوڕی مەسعود (خوا لێی ڕازی بێ) گێڕاتییانەوە. مسلم هەندێکی لە کتابی (الجمعة) بەشی (تخفيف الصلاة) (٥٩٣/٢) ژمارە (٤٦) لە فەرموودەی (إبن عباس) (خوا لێی ڕازی بێ)و باسی ئایەتە پیرۆزەکانی نەکردووە.

پێغەمبەر (ﷺ) ئەمەش هەقە، سا لە سۆنگەی سووربوونی ئیسلام لەسەر تەندروستی لەشەکان، پێغەمبەر (ﷺ) سەرنجی موسوڵمانانی ڕاکێشا –بەشێوەیەك کە پێش ئەوسا نەکرابوو– بۆ گرنگی دان بە خاوێنی دەم و ددان، لە دەیان فەرمایشتی پیرۆزدا. شتێکە هێشتا جێ سەرسوڕمانی پزیشکانی ددان و توێژەرەوانی تایبەتمەندن، هەر ئەوان بوون لە چەند ساڵێکی کەمدا زانیان پەیوەندیەکی پتەو هەیە لەنێوانی دەردی دەم و دەردی لاشە.

بەم دوایی یە پەردەیان لە ڕووی ئەوە لادا کە مۆڵگە زووخاوە بۆگەنەکانی دەمی نەخۆش کە میکرۆب و ژەهری لە ڕێی خوێنەوە دەچوو بۆ هەموو بەشەکانی لەش و تووشی دەکا، ئەمەیان ڕاستە، ئەوان زۆرمان بۆ دەڵێن دەربارەی ئەو مۆڵگانە، ترسناکییان دەگا بە چاو و گیرفانە لووتەکان، باس لەوەش دەکەن دەبێ بەهۆی هەوکردنی پەردەی ناوپۆشی گەدە و هەوکردنی قۆڵۆن و ریخۆڵە کوێرەشی لێ دەکەوێتەوە، ڕەنگە بەهۆشیەوە برینی دوازدە گرێشی لێ بکەوێتەوە یان هەوکردنی زەرداو و سیەکان و گورچیلە. هەروەها پێستیش تووش دەکا، ئەگەر زیانەکانیشی گەورە بوو دەگا بەوەی جومگەکانیش نەخۆش دەبن و سەرەنجامی ئەوانەش ئازار و ژانێکی زۆرە.

پوختەی قسان، ئەو باجەی نەخۆشی دەم و ددان دەیخاتە سەر باقی ئەندامەکان، گەورەو گرانە لە زۆر کاتدا، ئەمەش غەریب نیە بۆ دینێك لە هەموو ساتێك ئیمانداری بەهێزی خۆشەویست تر داناوە لە ئیمانداری لاواز، هەندێك گرنگی بدا بە خاوێنی دەمی موسوڵمانان وەك زەمانێك بۆ سەلامەتی لاشەکان و ساغی ئەندامەکان. بەو جۆرە بینیمان لە ئیسلامدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) جگە لە ئاو لە دەم وەرکردن بۆ شورانی پەردەی ناوپۆشی دەم و گەروو کە بەشێکە لەو دەست نوێژەی پێنج جار پێش نوێژەکان دەشورێ، موسڵمانانی هەڵناوە بۆ بەکارهێنانی سیواك بۆ پاك کردنەوەی ددان و لابردنی پاشماوەکانی خۆراك لەسەری، چونکە بە شیبوونەوەو بۆگەن بوونی ئەو پاشماوانە زۆرێك نەخۆشی دروست دەکەن، لەمەولا سەرنجی ئەوە دەدەی لە دەیان فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) بەشێوەیەکی گشتی و فراوان گرنگی داوە بە لایەنی دروستی لەش لە وەختێك کە زانستی پزیشکی بەو جۆرە پێشکەوتوو نەبووە.

ڕەنگە لە ڕاستی لانەدەین ئەگەر بڵێین سیواك هیچ کاتێك لە پێغەمبەر دانەبڕاوە. لە بەیانی لە ئێوارە لە بێداری لە نوستندا بە ڕۆژو شەو یاوەرانیشی هەروا بوون هەتا بەڕێوە ڕۆیشتوون و

سیواكیان لەسەر گوێچكەیان داناوە، لەو بارەوە (زەیدی كوڕی خالد) دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەیفەرموو: ((لولا أن أشق على أمتي لأمرْتُهُمْ بالسواكِ عند كل صلاة)).[١]

واتە: ئەگەر بارگرانی نەبوایە لەسەر ئۆمەتەكەم، فەرمانم پێ دەكردن لە هەموو نوێژێك سیواك بكەن.

ئەبوسەلەمە گوتی: زەیدم دیت لە مزگەوت دانیشتبوو سیواكی لەسەر گوێی دانابوو لە جێی قەڵەم لەسەر گوێی نووسەردا، هەركاتێ هەستابا بۆ نوێژ سیواكی دەكرد.

لە جابرەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: (كان السواك من أذن النبي (ﷺ) موضع القلم من أذن الكاتب)).[٢]

واتە: سیواك لەسەر گوێیی پێغەمبەر بوو لە جێی قەڵەمی گوێی نووسەر.

---

[١] ئەبوداود لە (الطهارة) بەشی سیواك (١/١٢) ژمارە (٤٧)و (ترمذي) لە (الطهارة) بەشی (ما جاء في السواك) (١/٣٥) ژمارە (٢٣) گوتی (حديث صحيح).

[٢] بگەڕێوە بۆ (تلخيص الحبير) (١/١١٨) بە مەرفوعی بە زەعیفی داناوەو گوتی: ڕاستیەكەی لەسەر (زەیدی كوڕی خالد) ڕاوەستاوە.

ئەمەش ئەبوهورەیرەیە (خوا لێی ڕازی بێ) لە فەرمایشتی پێغەمبەر حاڵی بووە کە بەردەوام هانی داوە بۆ سیواك کردنو دەڵێ: ئەمن پێش ئەوەی بنووم سیواکم دەکردو دوای ئەوەش بێدار دەبوومەوەو پێش نان خواردنو دوای نان خواردن، دوای ئەوەی گوێم لە پێغەمبەر بوو (ﷺ) دەیفەرموو لە گەورەیی سیواکدا.

مەبەستی پێ دەیان فەرموودەیە کە باس لە گەورەیی سیواك دەکەن. گومان لەوە نی یە ئەوانە بانگمان دەکەن پرسیار لە زانایان بکەین لە پیاوانی پزیشکیو کیمیاگەران لەو نهێنی یە شاراوەیەی کە خوای گەورە لە سیواکدا دایناوە تا شایانی ئەو هەموو پیاهەڵدانە بێ، بەڵێ با پرسیاریان لێ بکەین ئاخۆ بەڕاستی ئەو نهێنی یە ئەوەیە کە زانیوتانە دەربارەی پێکهاتە کیمیاییو جوانی بینای ئەو دارە بەسوودە؟.

ئەمانە هەموو دەخەمە بەردەستی خوێنەری بەڕێز لەو کتێبەدا تا هەموو موسوڵمانێك بتوانێ ئەوەندەی لێ وەرگرێ ڕێی پێ ڕۆشن کاتەوەو نیشانەکانی بۆ دەرکەوێو ڕەوشتی خۆی بەرەو ئەوێ بباو باشترین ڕێش ڕێی پێغەمبەری نازدارە (ﷺ).

خەڵکیش لەمڕۆ زۆر پێویستی سوننەتی پێغەمبەرن بە شێوەیەك ویستیان بۆی بچیو حەزیان لێ بێ بیکەن بە کردەوە، ئەوەندەش بەسە بۆ من ببم بە خزمەتکاری سوننەتی پاکی پێغەمبەر، تا بەرەکەتەکەی دامپۆشیو پڕوشکێکی بۆنەکەم بەرکەوێو ژینم پێ بۆن خۆش بوایەو دڵ پێی ئۆقرەی گرتبایەو ئومێدی هاتبا جێ، تا دەگەم بە خوای پەروەردگار لەژێر ئەو ئالایەو بەر ئەو دوعایە کەوم: (نضر الله إمرأً سمع منا حديثاً فحفظه حتى يبلغه، فرب حامل فَقِهَ إلى منْ هُو أفْقَهُ مِنْهُ، و رب حاملِ فَقِهَ ليس بفقيه) و في رواية (فربَّ مبلغٍ أوعى من سامع) فەرموودەیەکی (متواتر)ە ئەبوداود لە (العلم) بەشی (فضل نشر العلم) (٣٢١/٣) ژمارە (٣٦٦٠)و (ترمذي) لە (العلم) بەشی (ما جاء في الحث على تبليغ السماع) (٣٣/٥) ژمارە (٢٦٥٧) گوتی: فەرموودەیەکی (حسن صحيح)ە، إبن ماجه لە پێشەکی (باب من أبلغ علماً) (٨٤/١) ژمارە (٢٣٠)و دارەمی لە پێشەکی (باب الأقتداء بالعلماء) (٨٦/١) ژمارە (٢٢٨)، أحمد لە مسند (٤٣٧/١).

واتە: خوا نیعمەت بڕژێنێ بەسەر کەسێکداو جوانی بکا کە فەرموودەیەك لە ئێمە دەبیستێو لەبەری دەکاو دەیگەیەنێ بە کەسانی دی، ڕەنگە هەڵگری (فقه) بۆ کەسێکی لە خۆی زاناتر

ڕاگەیەنیّ و ڕەنگە هەڵگری (فقه) هەبیّ و (فەقیە)یش نەبیّ. لە ڕیوایەتێکی تر هاتووە (ڕەنگە ڕاگەیەنەرێك هەبیّ لە گویّ گرەکە زاناتر بیّ و تێگەیشتووتر بیّ). ئاقڵ مەند ئەو کەسەیە بیر کاتەوە لە میراتی پێشینەکان و سوودیان لیّ وەرگریّ و پەندی لیّ هەڵگریّ تا پیّ لە جێی پێیان دانیّ و نەخلیسکیّ تا دڵی ئیماندار بەند بیّ بە کتێبی خواو سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ)و شوێنەواری هاوەڵانی پێغەمبەرو شوێن کەوتوانیان، هەتا عەقڵی بەوانە ببەستیّ و بەکاری خا ئەوا خوای گەورە ڕێی نیشان دەدا.

ڕەحمەتی خوا لەو کەسە بیّ بە کەس و کاری گوت و ئامۆژگاریان دەکا:

إن الطريق صعبة عسيرة لكنها بالأقتفا يسيرة

واتە: ڕێگا سەختەو ناخۆشە بەڵام بەشوێن کەوتن ئاسانە.

خوایە ڕێگە ئاسان کەو ڕۆشنی کەوە، خوایە بەم کتێبە سوود بگەیەنە، داوا لە پەروەردگاری بەرزو بڵند دەکەم کە بە زانستەکەی سوودمەندمان کاو سەرکەوتوومان کا بۆ فەرمانبەری خۆی و بەسەر نەفسی خۆماندا زاڵمان کاو هەروەها داوای لیّ

دەكەم ئەو كارەم ببێتە شاهێد بۆم لە قیامەتو لە دوارۆژا تەرازووومان قورس كاو وای لێ بكا تەنها بۆ ئەو بێو سوودمەند بێ بۆ هەموو خوێنەرێك.

نووسینی

أبو ئالاء و روضة

د.كمال علي الجمل

مامۆستای زانستی فەرمووده لە

كۆلێژی (أصول الدين و الدعوة) لە منصورة

## یەکەم: پێناسەی سیواک:-

١- لە زمانەوانیدا: سیواک (بە کەسرەی سینەکە) بەو کراداوەو بەو دارە دەڵێن کە سیواکی پێ دەکرێ. نێرینەشە (مذکر)ە، (لیث) دەڵێ: عەرەب مێیینەشی دەکا (مؤنث) (ئەزهەری) دەڵێ: ئەمە لە هەڵەکانی (لیث)ە، خاوەنی (المحکم) دەڵێ: (مذکر)یش دەکرێ و (مؤنث)یش دەکرێ.

سیواک (کاری تۆیە بە سیواک)، دەڵێن: دەمی سیواک کرد بە سیواک ئەگەر گوتت: سیواکی کرد، ناوی دەم ناهێنی. کۆی سیواکیش (سُوُك)ە بە دوو (ضمّة) وەك (کتاب) (کُتُبْ)، خاوەنی کتێبی (المحکم) دەڵێ: دەبێ (سوُك) بە هەمزەش بەکاربێنی.

پێشەوا (نەوەوی) دەڵێ: ئینجا گوترا: ئەم (سوك)ە لە (ساك) وەرگیراوە ئەگەر شێلدرا، گوتراشە (منْ جاءت الأبل تستاك) واتە: ئەوەی ووشتر بۆی هات لە لاوازی دا بەلادادێ.

لە کتێبی (لسان العرب)یشدا هاتووە: (الأراك) دارێکی ناسراوە داری سیواکە، بە لقەکانی سیواك دەکرێ. (ئەبوحەنیفە) دەڵێ: باشترین شتێ سیواکی پێ بکرێ لقەکانیەتی. خۆشترین بۆنێك لەو شتانەی مالآت دەری دەدا (شیر)ە. ئەبوزیادیش دەڵێ: لەو دارە لە لق و ڕەگەکانی سیواك وەردەگیرێ و دروست دەکرێ.

باشترینیان ڕەگەكانیەتی لای خەڵك، دارێكی ناسراوە بەرێكی هەیە وەكو هێشووی ترێ وایە. (إبن شمیل) دەڵێ: (أراك) دارێكی درێژی سەوزی نەرمە گەڵاو لقو پۆپی زۆرە.[1]

٢- لە زاراوەی شەرع: بەكارهێنانی داری (ئەراك) یان هاوشێوەی بۆ پاك كردنەوەی ددان تا پاشماوە یان زەردایی لێ لادەی.[2]

## دووەم: حیكمەتی دانانی سیواك لە شەرعدا:

ڕەنگە حیكمەتی دانانی سیواك هۆیەكەی بۆ پاك كردنەوەی دەمو ددان بێ لە بۆنی خۆراكو شتی دی، هەروەك هۆیەكیشە بۆ ڕەزامەندی خوای گەورە لەبەر هەندێ پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: ((السواك مطهرة للفم مرضاة للرّب)).[3]

---

[1] سەیری (نیل الأوطار) بكە (١٣٣/١)، (صحیح مسلم) بە شەرحی (نەوەوی) (١٤٢/٣)، (النهایة) (٤٢٤/٢)، (طرح التثریب) (٦٢/٢)، (لسان العرب) (٤٩/١).

[2] نیل الأوطار (١٣٣/١).

[3] بوخاری لە (صحیح)ەكەیدا گێڕاویەتیەوە لە كتابی (الصیام) (باب) (سواك الرطب و الیابس للصائم) (٤٠/٣) تعلیقاً.

## سێ یەم: حوکمەکەی:-

سیواك لە سونەتە (مؤكدة)کانە، واتە جەخت لێکراوەو واجب نیە لە هیچ کاتێکدا لەبەر فەرموودەی پێغەمبەری خوا (ﷺ): ((لولا أن أشق على أمتي لأمرتهم بالسواك عند كل صلاه)).[1]

واتە: ئەگەر لەسەر ئۆمەتەکەم گران نەبایە فەرمانم پێ دەکردن لە هەموو نوێژێك سیواك بەکاربهێنن. پێشەوا نەوەوی دەڵێ: بە کۆ ڕای زانایان سوننەتە ئەوانەی لە کۆڕا حیسابیان بۆ دەکرێ.[2]

ئەبو حامیدی ئەسفەرایینی لە (داودی زاهیری) دەگێڕێتەوە کەوا گوتویەتی: لە نوێژدا واجبە، (ماوەردی) گێڕایتیەوە لەو کەوا گوتویەتی واجبە نوێژ بەتاڵ نابێتەوە بە واز لێ هێنانی. (إسحاق ی کوڕی ڕاهەوەی) دەڵێ: نوێژ بەتاڵ دەبێ بە نەکردنی.[3]

---

نەسائیش گەیاندوویەتی (١/١٠)، أحمد (٦/٤٧)، الحميدي (١١٢)، إبن ماجە (٨٩)، دارەمی (١٧٤) (ابن خزيمة) (١٣٥)، (ابن حبان) (١٤٣).

[1] بوخاری (٢/٨٨٧)و موسلیم لە (الطهارة) (١/٤٢).

[2] (صحيح)ی موسلم بە شەرحی نەوەوی (٣/١٤٢).

[3] سەیری (نيل الأوطار)(١/١٣٤) بکە، (طرح التثريب) (٢/٦٣).

ئەوانەی دەڵێن واجبە چەند بەڵگەیەکیان هەیە لەوانە:

أ-(ابن ماجة) گێڕایتیەوە لە (قاسم کوڕی أمامة) کەوا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((تسوکوا فإنّ السواك مطهرة للفم مرضاة للرّب، ما جاءني جبريل إلاّ أوصاني بالسواك، حتى لقد خشيت أن يفرض عليّ و على أمتي، و لولا أنّي أخاف أن أشق على أمتي لفرضته لهم)).[1]

واتە: سیواك بکەن چونکە سیواك دەم پاك کەرەوەیەو خواش ڕازی دەکات، جوبریل هەر جارێك هاتبێتە لام ئامۆژگاری کردووم بە سیواك کردن، هەتا ترسام لەسەرمو لەسەر ئۆمەتەکەم فەرز بێ، ئەگەر ترسی ئەوەم نەبایە لەسەر ئۆمەتەکەم گران دەبوو لەسەریان فەرزم دەکرد.

ئەو ڕیوایەتە لە سەنەدەکەی لاوازی هەیە، ئەگەریش ڕاست بێ ئەوا بەڵگەیە بۆ ئەوانەی دەڵێن سوننەتە نەك واجب، لەبەر ئەوەی دەڵێ: ((حتى لقد خشيت أن يفرض عليّ و على أمتي)) بەڵگەیە لەسەر واجب نەبوونی، ئەگەر فەرز بوایە واجب دەبوو لەسەر کردنی پاداشت دەبوو لەسەر نەکردنیشی سزا هەبوو.

---

[1] (إبن ماجة) لە (طهارة) باب السواك (١/١٠٦) سەنەدەکەی لاوازە هەروەك لە (زوائد) هاتووە.

ب- ئەو فەرموودەیەی کە پێشەوا (أحمد) لە فەرموودەی (أبي أمامة)ی گێڕاوەتەوە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((ما جاءني جبريل عليه السلام قط إلاّ أمرني بالسواك، لقد خشيت أن أحفى مقدم فيّ)).[1]

واتە: هەر جارێك جبریل سەلامی خوای لێ بێ هاتبێتە لام هەر فەرمانی پێ کردووم سیواك بکەم هەتا ترسام کە لێوی پێشەوەم شەق بکەم یا لێ ی بکەمەوە.

ج- ئەوەی (أحمد) لە فەرموودەی (تمام ی کوڕی عباس) دەری هێناو گوتی: ((أتوا النبي (ﷺ) أو أتى فقال: ما لي أراكم تأتونني قلحاً، استاكوا، لولا أن أشق على أمتي لفرضت عليهم السواك كما فرضت عليهم الوضوء)).[2]

واتە: هاتنە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: بۆچی دەتانبینم ددانتان زەردە؟ سیواك بکەن، ئەگەر لەسەر ئۆمەتەکەم گران نەبایە سیواکم لەسەر فەرز دەکردن هەروەك دەست نوێژم لەسەر فەرز کردوون.

---

[1] احمد لە (مسند) (٢٦٣/٣).

[2] أحمد (٤٤٣/٣).

د- ئەوەی (بيهقي) دەری هێناوە لە فەرموودەی (ابن عباس) (خوا لێ ی ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((تدخاون عليّ قلحاً إستاكوا))[1] واتە: بە ددان زەردی دێنە لام؟ سيواك بکەن!. (بەيهەقی) گوتی: ئەم فەرموودەيە جياوازی لە (اسناد)ەکەيدا هەيە. (حافظ إبن حجر) گوتی: فەرموودەی (عباس)و (تمام بن عباس)و (أبي أمامة) لاوازە.

(ئەبوبەکری کوڕی خەيثەمە) لە مێژوەکەی‌و (بيهقی)ش هەردووك لە (ابن عباس) گێڕايتيانەوەو (اسناد)يان بەهێز نيە. ئەگەر بەڕاستيش دابندرێ نەفی کردن لە تێگەيشتنی فەرموودەکە ئەوەيە: ((لولا أن أشق على أمتي لأمرتهم بالسواك عند كل صلاة)) (أمر) (فەرمانەکە) (مقيد)ە بە هەموو نوێژێك نەك بە (مطلق)ی فەرمانەکە، نەفی کردنی (مقيد) نابێتە هۆی نەفی (مطلق)و لە (ثابت) بوونی (مطلق)يش، دووبارە بوونەوە نيە.[2]

پێشەوا (نووی)يش دەڵێ: هاوەڵانی دواييمان نکوڵی يان کردووە لە شێخ (ابو حامد)و ئەوانی تر، واجبێتی لە (داود)ەوە

---

[1] (البيهقي) لە (الكبرى) لە (الطهارة) باب الدليل على أن السواك سنة و ليس بواجب (٢٦/١).

[2] فتح البارى (٣٧٦/٢).

گێڕاوەتەوەو گوتویانە مەزهەبەکەی ئەوەیە سوننەت بێ وەکو جەماعەت، ئەگەر ڕاست بایە واجب بوایە وەك (داود) ئەڵێ، ئەوا پێچەوانە کردنی زیانی نەدەبوو لەسەر ئەو (إجماع)ەی کە زۆربەی لێکۆڵەران لەسەرینە، بەڵام (إسحق) ئەو گێڕانەوەی بە ڕاست دانەناوە.[1]

پێشەوا (شوکانی) دەڵێ: گوێ نەدان بە جوداوازی (داود) لەگەڵ زانست و تەقواکەی و وەرگرتنی مەزهەبەکەی لەلایەن گەورەو پێشەوایەکان لەو دەمارگیریانەن کە پشت بەستیان نیە، تەنها هەواو دەمارگیری نەبێ.

ئەم شێوەیە لای مەزهەبیەکان باو بوو، جا نازانم ئەو بەڵگەیە چیە لای لێکۆڵەرەوان (محققین) تا ئەوانە لە بازنەی زانایانی موسڵمانان دەربێنن. سا ئەگەر لەبەر ئەوە بێ هەندێ گۆتەی دوور خواوەی لێ بیسترابێ، ئەوا بە نیسبەت گۆتەی جگە لەو کە بینا کراوە لەسەر ڕەئی دژ بە ڕیوایەتی ئاشکرا لە خەبەری کەمینەی خۆسەپێنەردا، جا مانەوە لەسەر ڕەئی و گوێ نەدان بە زانستی بەڵگە (علم الأدلة) وای لە کەسانێك کردووە

---

[1] سەیری (صحیح مسلم) بە (شرح النووی) بکە (١٤٢/٣)، و (المجموع) شەرحی (المهذب) (١٣٣/١).

بەرەو مەزهەب گەرایی برۆن کە لەگەڵ شەریعەت یەك ناگرنەوە کەمیان نەبن، هەرچی (داود)ە ئەو بیدعانەی لە مەزهەبەکەیدایە تووشی ئەوەی کردووە دەست بگرێ بە زاهیرو ووشك هەڵبێ لەسەری زۆر کەمە (بەڵام هەوای نەفس نهێنیەکی هەیە نازانرێ).[1]

## چوارەم:

## ئەو کاتانەی سیواك کردن تیایدا خۆشویستراوە (مستحبة):-

سیواك کردن (مستحبة) واتە خۆشەویست کراوە لە هەموو کاتێك بەڵام لە هەشت کاتان زیاتر:-

١- لە کاتی نوێژ کردندا جا ئەگەر دەست نوێژی بە ئاو گرتبێ یان خۆڵ یان بێ دەست نوێژ بێ وەك ئەو کەسەی نە ئاوی دەست دەکەوێ نە گڵ.

٢- لە کاتی دەست نوێژ شوشتن.

٣- لە کاتی خوێندنی قورئانی پیرۆز.

٤- لە کاتی لەخەو هەستان.

---

[1] نیل الأوطار (١/١٣٤).

٥- لە کاتی گۆڕانی بۆنی ناو دەم.

گۆڕانی بۆنی دەمیش بە چەند شتێکە لەوانە:

أ- نەخواردن و نەخواردنەوە.

ب- خواردنی شتێکی بۆن ناخۆش.

ت- زۆر بێدەنگی.

ث- زۆر گوتن.[١]

٦- لە کاتی چوونەوە ماڵ.

٧- لە کاتی چوونە مزگەوت.

٨- لە کاتی زەرد بوونی ددان.

## پێنجەم: سوودەکانی سیواك بە گشتی:-

١- دەم و ددان پاك کەرەوەیە.

٢- خوا لێ ی ڕازی دەبێ.

٣- فریشتەکان دڵیان پێی خۆشە.

---

[١] سەیری (صحيح مسلم) بە شەرحی (نەوەوی) (٣/١٤٢-١٤٣)، نيل الأوطار (١/١٣٤).

٤- چاكە زیاد دەكات.

٥- لە سوننەتەكانی پێغەمبەرە (ﷺ).

٦- چاو گەش دەكاتەوە.

٧- پووك بەهێز دەكا.

٨- بەڵغەم لادەبا.

٩- بۆنی دەم خۆش دەكا.

١٠-گەدە باش دەكا.

١١-زمان پاراو دەكا.

١٢-ناهێڵێ ددان كلۆر بێ.

١٣-خوێندنەوەو زیكر بەهێز دەكا.

١٤-فریشتەكان سەریان لێ سوور دەمێنێ.

١٥-مێشك پاك دەكاتەوە.

١٦- حەزی خواردن زێدە دەكا.

١٧- قسە كردن ڕەوان دەكا.[١]

---

[١] سەیری (طرح التثريب) (٦٧/٢) بكە.

**سوودێک:**

قشەیری باس دەکا بۆ سەنەد لە ئەبی دەردا دەڵێ: سیواك بکەن لێی بێ ئاگا مەبن، سا لە سیواکدا بیست و چوار سوودی هەیە باشترینیان خوا ڕازی دەکا، سوننەتە، حەفتاو حەفت جار نوێژ زیاد دەکا، فراوانی و دەوڵەمەندی جێ دەهێڵێ، تامی دەم خۆش دەکا، پووك (پدوو) بەهێز دەکا، ژانەسەر ناهێڵێ، ژانی ددان دەشکێنێ، فریشتە تەوقەی لەگەڵ دەکەن لەبەر نووری دەم و چاو بریسکەی ددانی. (حافظ کوڕی حەجەر) دەڵێ: باسی ماوەکەی دەکا، بنچینەی نیە، نە لە فەرموودەی (صحیح) نە لاواز.[1]

**شەشەم:**

**ئەوەی لە سیواکدا (مستحب)ە و بە ڕاست دەگەڕێ:-**

پێشەوا غەزالی: دەڵێ: سیواك بە لقی دار دەکرێ، ڕافعی دەڵێ: ئەمە بە مەرج ناگیرێ بەڵام لە شتی دی باشترە. دەڵێ: باشتر وایە ووشك بێ و بە ئاو نەرم کرێ، بنچینەی سوننەت

---

[1] سەیری (تلخيص الحبير) (١/١١٩) بکە.

ئەوەیە بە هەموو شتێکی دڕو زبر بۆ لابردنی پاشماوەی سەر ددان وەك: پەڕۆی زبر[1] و دارو شتی لەو شێوەو پەنجە.[2]

### - سیواك کردن بە پەنجەی دەستو حوکمەکەی:-

زانایان جیایی یان هەیە لە حوکمی سیواك کردن بە پەنجە، هەندێکیان دەڵێن: ئەگەر پەنجەکە نەرم بوو سیواکەکەی پێ نایەتە جێ، ئەگەر زبریش بوو سێ ڕووی هەیە:—

یەکەم: سیواکەکە پێی نایەتە جێ لەبەر ئەوە پێ ی ناگوترێ سیواكو مانای سیواکیش نابەخشێ، ئەمەش قسەی (جمهور)ە.

دووەم: سیواکی پێ دێتە جێو لەبەر ئەوە مەبەستەکە دێنێتە جێ لە پاك کردنەوەو لابردنی پاشماوەکە، بەڵگەشیان فەرموودەیەکی لاوازە کە (بیهقی) دەری هێناوە لە ئەنەسەوە (خوا لێی ڕازی بێ) دەفەمووێ: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: پەنجەکان سیواکیان پێ دەکرێ هەروەها بە فەرموودەی ئەنەس کە بەرزی دەکاتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: ((تجزئُ

---

[1] سەیری (تلخیص الحبیر) (١١٩/١) بکە، زبر: دڕ پێچەوانەی نەرم.

[2] (تجزئ من السواك الأصابع)، (بیهقی) لە (سنن الکبری) دەری هێناوە لە کتابی (الطهارة) (باب الاستیاك بالأصابع) (٤٠/١-٤١).

الأصابع مجرى السواك)) (بيهقی) دەری هێناوەو لە پاشان دەڵێ: بەو شێوەیەم دۆزیوەتەوە لە کتێبی (عیسی کوڕی شوعەیب)، ئەوەی پارێزراوە لە فەرموودەی (ابن المثنی)، (أبو الحسین) کوڕی شیران خەبەری پێداوین کەوا (أبو جعفری ڕەزاز) پێی ڕاگەیاندووین (أحمدی کوڕی إسحق ی کوڕی صالح) پێی ڕاگەیاندووین، (خالدی کوڕی فەداش) پێی ڕاگەیاندووین، (عبدالله ی کوڕی مثنی ی ئەنصاری) پێی ڕاگەیاندووین، گوتی هەندێك لە کەسو کارم پێیان گوتووم کە ئەنەسی کوڕی مالك گوتویەتی: پیاوێك لە ئەنصاریان لە بەنی (عمروی کوڕی عەوف) گوتویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا تۆ هانت داوین بۆ سیواك کردن، ئایا بێجگە لەو هیچ شتی تر هەیە؟ فەرمووی: ((إصبعاك سواك عند وضوئك، تمرهما علی أسنانك، إنه لا عمل لا نية له، و لا أجر لمن لا حسبة له)).[1] واتە: دوو پەنجەت سیواکن لە کاتی دەست نوێژدا، بەسەر ددانەکانت دادەهێنی، بەڕاستی هەر کەس نیەتی باشی نەبێ بۆ کارێك، کارەکەی بۆ حسێب ناکرێ، پاداشتیش بۆ کەسێك نیە کارەکەی لەبەر خاتری خوا نەکردبێ.

---

[1] (بيهقی) دەری هێناوە لە (سنن الكبری) لە (كتاب الطهارة) (باب الاستياك بالأصابع) (١/٤٠)، لە سەنەدەکەی (عبدالحكم القسملي البصري) هەیەو (حديث منكر)ە.

سىٰ يه‌م:- رافيعى واى ده‌بينىٰ ئه‌گه‌ر دارت ده‌ست نه‌كه‌وت ئه‌وا به په‌نجه ده‌بىٰ ئه‌گه‌رنا نابىٰ.[١]

ڕه‌نگه پشتى به‌ستابىٰ به فه‌رمووده‌ى (أبى مطر) كه ده‌ڵىٰ: ((بينما نحن جلوس مع أمير المؤمنين علي رضي الله عنه في المسجد على باب الرحبة جاء رجل فقال: أرني وضوء رسول الله (ﷺ) و هو عند الزوال، فدعا قنبراً فقال: ائتنى بكوز من ماء فغسل كفيه و وجهه ثلاثاً و نضمض ثلاثاً، فأدخل بعض أصابعه في فَيْهِ و استنشق ثلاثاً و غسل ذراعه ثلاثاً... الحديث مطولاً)).[٢]

واته: ئێمه له‌گه‌ڵ ئه‌ميرى ئيمانداران (عه‌لى) دانيشتبوين له مزگه‌وت له ده‌رگاى (الرحبه)، پياوێك هات گوتى ده‌ست نوێژى پێغه‌مبه‌رى خوام فێركه له كاتى نيوه‌ڕۆ بوو، ئه‌ويش بانگى قه‌نبه‌رى كردو فه‌رمووى مه‌سينه‌يه‌ك ئاوم بۆ بێنه، هه‌ردوو ده‌ستو ده‌مو چاوى شوشت سىٰ جار ئاوى له ده‌م وه‌ركرد سىٰ جار، هه‌ندىٰ په‌نجه‌كانى خسته ناو ده‌مىو سىٰ جار فنى كرد

---

[١] سه‌يرى (المجموع شرح المهذب) (٣٤١/١) بكه.

[٢] الفتح الرباني (١١/٢).

(شتی ناو لووتی دەرکرد)، باسکی سێ جار شوشت...
فەرموودەکە دوورو درێژە.

جا لە فەرموودەکە هاتووە: ((فادخل بعض أصابعه في فيْهِ))
بەلگەیە لەسەر ئەوەی کە سیواك کردن بە پەنجە دروستە. خوا
زاناترە.

## حەوتەم:- شێوەی ئەو سیواك کردنەی فەرمانی پێکراوە:-

ئەبونەعیم لە کتێبی سیواکەکەیدا نوسیویەتی بە سەنەدێکی
لاواز لە عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێ) گێڕاویەتیەوە دەڵێ:
((كان النبي (ﷺ) يستاك عرضاً و لا يستاك طولاً)).[١]

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) سیواکی بە پانی بە ددانەکانیدا
هێناوە نەك بە باری درێژی.

لە سەنەدەکەی لاوازی هەیە وەك (حافظ ی عێراقی) باسی
کردووە. ئەبوداودو (العقيلي)و (ابن عدی) لە (عطاء)ەوە

---

[١] بەو شێوە ئەبوداود لە (مرسيل) (٧٤/١) ژمارە (٥) دەری هێناوە
سەنەدەکەی لاوازە بۆ (ارسال)ەکەو جەهالەتی (محمد بن خالد القرشی)،
(بيهقي) لە (السنن الکبری) (٤٠/١) لە ڕێگەی (أبی داود)ەوە گێڕاویەتیەوەو لە
سەنەدەکەی (أبو نعيم عبدالله بن حکيم) هەیە ئەویش (متروك)ە، وەك (ابن
حجر) لە (تلخيص الحبير) (١٠٩/١) باسکردووە.

گێڕايتيەوە بەرزی كردووەتەوە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموويەتی: ((إذا شربتم فاشربوا مصاً، و إذا استكتم فأستاكوا عرضاً)).

واتە: ئەگەر ئاوتان خواردەوە بە مژين بيخۆنەوە، ئەگەريش سيواكتان كرد بە باری پانی ددانەكانتان بيكەن.[1]

(إبن مندە) لە هاوەڵانەوە گێڕاوەتيەوە لە فەرموودەی (بهز) دەڵێ: ((كان رسول الله (ﷺ) يستاك عرضاً))[2] البيهقی گێڕاوەتيەوەو دەڵێ ئەو (بهز)ە بەو فەرموودەيە دەناسرێ. مەبەست لە گوتەی (عرضاً) پانی ددان لە درێژايی دەمدا. جيايی يان هەيە لەسەر ئەوەی ئايا سوننەتەكە دێتەجێ بە سيواك كردن بە باری درێژی يان نا؟ سا ڕافيعی لە پێشەوای (حەرەمەين)ی گێڕاوەتەوە كەوا سيواكی بە باری درێژیو پانی كردووە، ئەگەر تەنها بە يەك لا كرا ئەوا باری پانی باشترە لەبەر

---

[1] لاوازە: ئەبوداود لە سەرچاوەكەی پێشوو دەری هێناوە، (العقيلی) لە (لاوازەكان) (٣/٢٢٩)، (ابن عدی) لە (الكامل) (٧/١٨٢)، (الطبراني) لە (الكبير) (٢/٤٧-٤٨) ژمارە (١٢٤٢) (البيهقی) لە (الكبری) (١/٤٠)، دەری هێناوە.

[2] (البيهقی) لە (كبری) (١/٤٠).

فەرموودەی ((إستاكوا عرضاً)) هەندێکی تر دەڵێن: بە باری پانی ددان سیواك دەکرێ نەك بە باری درێژی.

(نەوەوی) لە شەرحی (المهذب) دەڵێ: ئەگەرچی پێچەوانەکەی کردو بە باری درێژی سیواکی کرد سیواك کردنەکە دێتە جێ، ئەگەر پێچەوانەی باشترەکەی کردووە.

لە شەرحی (صحيح مسلم) دەڵێ: ئەگەر بە باری درێژی سیواکی کرد ئەوا سیواك کردنەکە دێتەجێ لەگەڵ ناپەسەندیەکەی.[1]

وا پەسەندە سیواکەکە لە لای ڕاستەوە دەست پێ بکەی، لەبەر ئەوەی فەرموودە لە عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێ) هاتووە: ((كان النبي (ﷺ) يعجبه التيامن في ترجله و تنعله و تطهره و سواكه)).[2]

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) دەستە ڕاستی پێ خۆش بووە لە سەر داهێنانی‌و نەعل لەپێ کردنی‌و خۆپاك کردنەوەو سیواك کردنیدا.

---

[1] (صحيح مسلم) بە شەرحی نەوەوی (١٤٣/٣)، (طرح التثريب) (٧٠/٢).

[2] بوخاری دەری هێناوە لە دەستنوێژدا لە (باب التميم في الوضوء و الغسل) (٣٢٤/١) ژمارە (١٦٨) (٥٣/١)، أحمد (١٨٨/٦).

هەندێ لە شافیعی یەكان دەڵێن: ئەو فەرموودەیە ئەوەی لێ وەردەگیرێ ئایا سیواك لە بازنەی پاك كردنەوەیە یا لابردنی پیسی؟ ئەگەر لە پاك كردنەوەو بۆن خۆش كردن بێ وا باش‌و پەسەندە بە دەستی ڕاست بكرێ ئەگەر لە لابردنی پیسی بێ وا باشە بە دەستی چەپ بكرێ، لەبەر فەرموودەی عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەفەرموێت: ((كانت یدُ رسول الله (ﷺ) الیمنی لطهوره و طعامه، و كانت یده الیسری لخلائه، و ما كان من أذی)).[1]

---

[1] سەیری (طرح التثریب) (٧١/٢) بكە، كەڕاندویەتەوە بۆ (أبی داود)و گوتویەتی ئیسنادەكەی ڕاستە، فەرموودەكە ئەبوداود لە (الطهارة) لە (باب كراهیة مس الذكر بالیمین) (٨/١) ژمارە (٣٣) دەری هێناوە. إحمد (٢٨٨/٦) دەری هێناوە.

## هەشتەم: سیواك كردن بۆ ڕۆژووەوان:-

مەزهەبی جمهور لەسەر ئەوەن سیواك كردن پەسندە بۆ ڕۆژووەوان لە سەرەتاو كۆتایی ڕۆژدا، لەبەر فەرموودەی (عامری كوڕی ڕەبیعە) دەڵێ: ((رأيت رسول الله (ﷺ) ما لا أحصي يتسوك و هو صائم)).[1]

واتە: چەند جار پێغەمبەرم دیتووە (ﷺ) كە پێم نازمێردرێ، سیواكی كردووەو بەڕۆژووش بووە.

وە فەرموودەی عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: ((من خير خصال الصائم السواك))[2] بوخاری دەڵێ: ابن عمر دەڵێ: ((يستاك أول النهار و آخره))[3] واتە: سەرەتاو كۆتایی ڕۆژەكە سیواكی كردووە.

---

[1] (حسن)ە ئەبوداود لە (الصيام) لە (باب السواك للصائم) (٢٣٦٤)و (ترمذي) لە (الصيام) لە (باب ما جاء في السواك للصائم) (٧٢٥/٣)، أحمد (٤٤٥/٣).

[2] إبن ماجه لە (الصيام باب السواك للصائم) (١٦٧٧)، ابن حەجەر لە (تلخيص الحبير) (١١٤/١) لاوازی كردووە.

[3] بوخاری بە (تعليق) لە (الصوم) باب (٢٥) گێڕاویەتەوە.

بەڵام شافیعی دوای ڕۆژ داکەوتن (زوال) بە ناپەسندی داناوە بە بەڵگەی فەرموودەی (ئەبوهورەیرە) (خوا لێی ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی: ((لخلوف فمِ الصائم أطيب عند الله من ريح المسك)).[1]

واتە: بۆنی دەمی ڕۆژوەوان (کە ناخۆشە) لە لای خوا خۆشترە لە بۆنی میسك. قسەیەکی تریان لە ئیمام شافیعی گێڕاوەتەوە کەوا: سەرەتاو کۆتایی ڕۆژ قەیدی ناکا سیواك بکەی.

## نۆیەم: سیواك کردن بۆ نوێژی فەرزو سوننەت پێکەوە:-

ئەوەی سەیری فەرموودەی پێغەمبەر بکا (ﷺ) ((لولا أن أشق على أمتي لأمرتهم بالسواك عند كل صلاة)).[2]

واتە: ئەگەر گرانو قورس نەبا لەسەر ئۆمەتەکەم، ئەوا لە هەموو نوێژێك فەرمانم پێ دەکردن سیواك بکەن.

---

[1] بوخاری لە (الصوم باب فضل الصوم) (٤/١٢٥) ژمارە (١٨٩٤)و موسلیم لە (الصيام) فەرموودەی (١٦٢-١٦٤).

[2] بوخاری لە (الجمعة باب السواك يوم الجمعة) (٢/٨٨٧)، موسلیم لە (الطهارة باب السواك) (١/٤٢) لە فەرموودەی ئەبوهورەیرە گێڕاویەتیەوە.

دەگاتە ئەوەی کە سیواك کردن بۆ نوێژی فەرزو سوننەت پەسندە پێکەوە، ئەمەش لەبەر فەرموودەی ((عند کل صلاة)) گۆتەیەکی گشتی یە لە هەموو نوێژێك سا لەبەرچی نوێژێك تایبەت بکرێ جگە لە نوێژی تر؟ بەڵام هەندێ زانا بۆ ئەوە چوون کە سیواك پەسەندە تەنها بۆ نوێژی فەرز، هەروەها بۆ ئەو سوننەتانەی کە پاشی نوێژی تر نین وەك نوێژی جەژن.

ئەوانەش بەڵگەیان ئەو فەرموودەیە کە پێشەوا ئەحمەد لە (مسند)ەکەیدا گێڕاویەتیەوە لە فەرموودەی خاتوو (زینب کچی جەحش) (خوا لێی ڕازی بێ) کە دەفەرموێ: ((لأمرتهم بالسواك عند کل صلاة کما یتوضؤن))[1] واتە: فەرمانم پێ دەکردن سیواك بکەن لە هەموو نوێژێکدا وەك دەست نوێژ گرتن. هەروەها پێشەوا (أحمد) لە ئەبوهورەیرەوە دەگێڕێتەوە کەوا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((لولا أن أشق علی أمتي لأمرتهم عند کل صلاة بوضوء و مع کل وضوء بسواك، ولأخرت العشاء إلی ثلث اللیل، أو شطر اللیل)).[2] واتە: ئەگەر لەسەر ئۆمەتەکەم گران نەبایە لە هەموو نوێژێك فەرمانم پێ دەکردن دەست نوێژ بگرن و

---

[1] أحمد (٦/٤٢٩).

[2] أحمد (١/٢٩٤) (الفتح الرباني).

لەگەڵ هەموو دەست نوێژێکیش سیواك بکەن، نوێژی عیشاشم دوادەخست بۆ سێ یەکی شەو یا نیوەی شەو.

لە گێڕانەوەی بوخاری دا هاتووە: ((لأمرتهم بالسواك مع كل وضوء))[1] واتە: فەرمانم پێ دەکردن لەگەڵ هەموو دەست نوێژێك سیواك بکەن.

پێغەمبەر (ﷺ) یەکسانی کردوون، هەروەك دەست نوێژ سوننەت نیە بۆ نوێژی سوننەتی (راتب)ەی دوای (نوێژی فەرز) مەگەر ماوەی نێوانیان زۆر بێ، هەروەها سیواکیش بەو شێوەیە.[2]

من وای دەبینم (خوداش زاناترە)، سیواك پەسندە (مستحب)ە بۆ نوێژی فەرزو سوننەت پێکەوە، لەبەر ئەو گوتە گشتی یەی پێغەمبەر (ﷺ) ((کل صلاة)) هەروەها سیواك داندراوە بۆ پاك کردنەوەو لابردنی پیسی، ئەمەش لە هەموو کاتو ساتێك پێویستە، چۆن تایبەت دەکرێ تەنها بە نوێژە فەرزەکان، بە تایبەت لە پێغەمبەر (ﷺ) جێگیر بووە (ثابت) کەوا لە نێوان هەردوو ڕکاتێکی شەونوێژدا سیواکی کردووە. جا

---

[1] البخاري (٨٨٧/٢).

[2] سەیری (فتح الباري) (٣٧٦/٢) بکە.

لە فەرموودەی (إبن عباس) (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ((كان رسول الله (ﷺ) يصلي بالليل ركعتين ثم ينصرف فيستاك)).[1]

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) شەوان شەونوێژی دەکرد دوو ڕکات دوو ڕکاتو دوایی وازی دەهێناو سیواکی دەکرد.

جابر (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((إذا قام أحدكم من الليل يصلي فليستك، فانهً إذا قام يصلي أتاه مَلَك، فيضع فاه على فيْهِ، فلا يخرج شئ من فيه إلا وقع في الملك)).[2] واتە: ئەگەر یەکێکتان شەو هەستاوە بۆ شەونوێژ با سیواك بکا، لەبەر ئەوەی ئەگەر هەستا فریشتەیەك دێتە لایو دەمی لەسەر دەمی دادەنێ، هەر شتێك لە دەمی دەرچێ دەچێتە دەمی فریشتەکەوە. دیارتریش لەوە ئەوەیە کە (مسلم) ڕیوایەتی کردووە لە (عائیشە) (خوا لێی ڕازی بێ) کاتێ (سعدی کوڕی هیشام) پرسیاری لێ کرد دەربارەی (وتری)ی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((كنا نعدُّ لهُ سواكه و طهوره فيبعثه الله ما شاء أن يبعثه من الليل فيتسوك و يتوضأ و يصلي

---

[1] (ابن ماجه) دەری کردووە لە (الطهارة باب السواك) (١٠٦/١).

[2] بگەڕێوە بۆ (تلخيص الحبير) (١١٢/١). (حافظ ابن حجر) دەڵێ: أبونعيم گێڕاویەتیەوە راویەکانیش جێی متمانەن، (ابن دقيق العيد) وا دەڵێ.

تسع ركعات...الحديث)).[1] واتە: سیواكو دەست نوێژی پێغەمبەرمان دەژمارد. سا خوای گەورە بەخەبەری دەهێناو بێداری دەكردەوە تا خۆی حەزی دەكرد، جا دەست نوێژی دەشوشتو نۆ ڕكاتی دەكرد.

هەندێ لە مالیكیەكان دەڵێن: سیواك كردن لەناو مزگەوتدا ناپەسەندە نابێ بكرێ، لەناو كۆمەڵی خەڵكیشدا لەبەر پیسیەكەیو مزگەوت لەوە پاكترە دەبێ پاك ڕاگیرێ. وتوویانە: مەبەست لە فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ): ((مع كل صلاة))و فەرموودەی ((عند كل صلاة)) واتە: لە هەموو نوێژو دەست نوێژێكدا یان لەگەڵ هەموو دەست نوێژێكی نوێژدا. بەڵگەشیان فەرموودەی خوایە لە ئایەتی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى ٱلْمَرَافِقِ وَٱمْسَحُواْ بِرُءُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى ٱلْكَعْبَيْنِ﴾ (المائدة:٦).

واتە: ئەی ئیمانداران ئەگەر هەستان بۆ نوێژەكانتان دەمو چاوو دەستتان تا ئانیشك بشۆن لەگەڵ پێیەكانتان تا گۆزینگ (قولەپێ)و سەرتان (مسح) بكەن واتە دەستی تەڕ بەسەردا بێنن.

---

[1] (مسلم) لە (صلاة المسافرین) (باب صلاة اللیل و من نام عنه أو مرض) (٦/٢٦-٢٧).

وتوویانە: خوای گەورە هەستاو بۆ دەست نوێژ وەك هەڵساو بۆ نوێژی حسێب کردووە. لەو هۆیانەی بە ناپەسەندیان داناوە ئەوەیە دەڵێن ڕەنگە لەگەڵ سیواك کردن خوێنی لێ بێو دەست نوێژ بەتاڵ دەبێتەوە.[1] زانایان باش ڕووبەڕوویان بوونەوەو وتوویانە سیواك کردن لە مزگەوتدا دروستەو سوننەتێکی جێگیرە لە کاتی نوێژدا لەبەر فەرموودەی ((لأمرتهم بالسواك عند كل صلاة))و زۆر فەرموودەی تر.

بەڵکو هەندێ لە گێڕانەوەکان بەڵگەی ئەوەن کە یاوەرانی پێغەمبەر (ﷺ) (خوا لێیان ڕازی بێ) لەناو مزگەوتدا سیواکیان دەکردو سیواکیان لەسەر گوێچکەیان دادەنا لە هەموو نوێژێك سیواکیان پێ دەکرد.

جا لە (زەیدی کوڕی خالید) (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ((كان أصحاب رسوا الله يضعون أسوكتهم خلف آذانهم، يستنون بها كل صلاة)).[2]

---

[1] سەیری (مواهب الجليل) (٢٦٦/١) بکە.

[2] ئەبوداود لە (الطهارة باب السواك) (١٢/١) ژمارە (٤٧) گێڕاویەتیەوە. (ترمذي) لە (الطهارة باب ما جاء في السواك) (٣٥/١) ژمارە (٢٣) لە زەیدی کوڕی خالدو (ترمذي) دەڵێ فەرموودەیەکی (حسنو صحيح)ە.

واتە: هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) سیواکیان لە پشت گوێچکەیان دادەناو لە هەموو نوێژێك سیواکیان پێ دەکرد.

شێخی ئیسلام (إبن تیمیة) دەڵێ: کەسێ لەناو مزگەوت بوو، ئەگەر بەڵغەمی هەبوو بۆی هەیە تف لە جلەکانی بکا بە رێکەوتنی پێشەواکان‌و بە سوننەتی جێگیری پێغەمبەر (ﷺ) بەڵکو دەست نوێژ لەناو مزگەوتدا دروستە بشورێ لای (جمهوری زانایان)، جا ئەگەر دەست نوێژ گرتن دروست بێ سیواکیشی تێدایەو دروستە.

جا ئەگەر تف کردن بە بەڵغەم لە جل‌و بەرگ دروست بێ لەناو مزگەوتدا چۆن سیواك کردن ناپەسەندەو ناکرێ؟ نوێژیش لە مزگەوت بێ سیواکی لەگەڵ دەکرێ جا چۆن سیواك ناپەسەندە (مکروه)ە؟ ئینجا شێخی ئیسلام دەڵێ: بەڵام بانگەشەی خوێن لێهاتن هیچ بەڵگەی لەسەر نی یە، بەڵێ ئەوەی لەوە دەترسێ با بە هێواشی‌و لەسەرەخۆ بەکاری بێنێ‌و لەسەر ددان‌و زمان بەکاری بێنێ نەك پدوو (پووك).[1] (خوا زاناترە).

---

[1] سەیری (فتاوی) (٢٢/٢٠١) بکە.

## دەیەم:

## ئایا دەبێ بە سیواکی یەکێکی دی سیواک بکەی؟:-

زانایان وتوویانە: مرۆ دەتوانێ سیواک بکات بە سیواکی یەکێکی دی بە ڕەزامەندی ئەوو هیچ ناپەسەندیەکی (كراهة) نیە، بەڵام هەر ئەوەیە دەبێ سیواکەکە بشوری، لەبەر پیسیو لیکو شتی تر کە پێوەی نووساوە. بەڵگەی ئەوەش ئەوەیە: ئەبوداود لە (سنن)ەکەیدا گێڕاویەتیەوە لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) سیواکی دەکردو دەیدا بە من بیشۆم، سیواکم پێ دەکردو دەمشوشتو دەمدایەوە ئەو. ((عن عائشة قالت: كان نبي الله (ﷺ) يستاك فيعطيني السواك لأغسله، فابدأ به فاستاك ثم أغسله و أدفعه إليه)).[1]

لەم فەرموودەیەدا دەبینین کە خاتوو عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) ویستویەتی سیواک بکا بێ شوشتنی بۆ بەرەکەتی لیکی پێغەمبەر (ﷺ)و بۆ شیفای نەخۆشیش، ئەگەر ئەمە بەڵگە بێ بۆ شتێك ئەوا بەڵگەیە بۆ گەورەیی ئەدەبو زیرەکی عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) لەبەر ئەوەی سەرەتا نەیشوشت تا شیفای بە

---

[1] أبوداود لە (سنن) دەری کردووە (كتاب الطهارة باب غسل السواك) (١/٧٨).

لیکی پێغەمبەر (ﷺ) لەدەست نەچێ. دوایی شوشتنی بۆ ڕێز گرتن‌و جێبەجێ کردنی فەرمانی پێغەمبەر (ﷺ).

ڕەنگە مەبەستی بە شوشتنی سیواکەکە پاك کردنەوەو نەرم کردنەوەی بێ بە ئاو پێش ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) بەکاری بێنێ.

بەڵام حیکمەت لە شوشتنی سیواك پێش بەکارهێنانی، پزیشکەکان وەڵامی ئەوانە دەدەنەوە بەوەی سیواك بۆ پاك کردنەوەی ددانەو ئەو پاککەرەوەش دەبێ بشورێ لە کاتێك بۆ کاتێکی دی تا پیس نەبێ‌و ببێتە مۆڵگەی میکرۆبەکان.

دکتۆر (عبدالرحیم محمد) مامۆستای (مشارك) لە کۆلیژی ددانسازی زانکۆی (شا سعود) هەستا بە توێژینەوەیەکی زانستی لەسەر سیواك، تیایدا دەرکەوت سیواك هیچ زیانی نی یە لەسەر شانەکانی دەوری ددان بۆ ماوەی (٢٤) کاتژمێر لە بەکارهێنانی بەڵکو زۆر سوودیشی هەیە. بەڵام ئەگەر سەری سیواك لە ڕۆژێك زیاتر بەکاربێ‌و نەبڕدرێ ئەوا هەندێ مادە کە مادەی (فیتۆلی)ە کار دەکەنە سەر شانەکانی دەوری ددانەکان. لەبەر ئەوە تەنها

بۆ ماوەی (٢٤) کاتژمێر دەبێ بەکاربێ، دوای ئەوە دەبڕدرێو بەشێکی دی نوێ بەکاردەهێنرێتەوە.[١]

لەو فەرموودانەی کە بەڵگەن بۆ دروست بوونی سیواك کردن بە سیواکی یەکێکی تر ئو فەرموودەیەی (بوخاری)[٢] بۆی گێڕاوینیتەوە لە فەرموودەی عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) فەرموویەتی: ((دخل عبدالرحمن بن أبي بكر على النبي (ﷺ) و أنا مسندته إلى صدري، و مع عبدالرحمن سواك رطب يستن به فأبده[٣] رسول الله (ﷺ) بصره، فأخذت السواك فقضمته و نقضته وطيبه، ثم دفعته إلى النبي (ﷺ) فاستن به، فما رأيت رسول الله (ﷺ) استن استناناً قط أحسن منه فما عدا أن فرغ رسول الله (ﷺ) رفع يده أو أصبعه، ثم قال: ((في الرفيق الأعلى ثلاثاً)) ثم قضى و كانت تقول: مات بين حاقنتي و ذا قنتي)).

واتە: عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکر (خوا لێیان ڕازی بێ) هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) منیش پاڵم پێ دابووە سەر سینگی

---

[١] سەیری کتێبی (السواك و العناية بالأسنان) لاپەڕە (٢٢٢)و کتێبی (السواك في السنة) لاپەڕە (٥٣–٥٤).

[٢] البخاری لە کتابی (المغازی) باب (مرض النبي (ﷺ) و وفاته) (١٣٨/٨).

[٣] واتە: چاوی تێ بڕی.

خۆم عەبدوڕەحمانیش سیواکێکی تەڕی پێ بوو سیواکی پێ دەکرد، پێغەمبەریش (ﷺ) چاوی تێ بڕی، منیش سیواکەکەم لێ وەرگرتو کرۆژشمو دام وەشاندو پاکم کردەوەو ئینجا دامە دەست پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەویش سیواکی پێ کرد، هەرگیز سیواکی وا ڕێكو پێکی نەکردووە، هەر کە تەواو بوو دەستی یان پەنجەی بەرز کردەوەو سێ جار فەرمووی: بەرەو هاوەڵی هەرە بەرز (في الرفيق الأعلى) ئەوجا گیانی پاکی سپارد عائیشە دەیفەرموو: پێغەمبەری خوا لەنێوان شانو چەناگەی مندا کۆچی دوایی کرد. (واتە: لە باوەشی من بوو).

سا لەم فەرموودەدا بەڵگە هەیە لەسەر ئەوەی دەکرێ سیواکی یەکێکی دی بەکاربهێنی بە مەرجێ لەو کەسانە بێ بۆنی دەمی ئەوت پێ ناخۆش نەبێ ئەگەر وا نەبوایە خاتوو عائیشە نەیدەگۆڕی.

لە کرۆشتنی سیواکەکە لەلایەن خاتوو عائیشە حیکمەتێك هەیە تەنها شارەزایان دەیزانن لە ڕووی پزیشکیو خەڵکانی سرووشت ڕێكو تەواو.

**لە گرنگترین سوودەکانی کرۆشتنی سیواك:**

١- ئەو مادانەی لەناو سیواکدا هەیە لەو بەشەی بەکارهاتووە ڕەنگە کۆتایی پێ هاتبێ.

٢- ئەو بەشەی بەکاردێ وەبەرهەوا دەکەوێ، ڕەنگە پیس بووبێ بە کۆتایی هاتنی مادەکانی ناوی، جا لابردنی ئەو بەشەی بەکارهاتووە هەموو ئەگەرێك لادەبا بۆ پیس بوون بە میکرۆب‌و تەپ‌و تۆز. بە بەکارهێنانی بەشە نوێ یەکە دەگەینە یەقین‌و دڵنیایی لە پاکی ڕیشاڵە نوێیەکانی بەکاری دەبەین.[1]

لە پاك کردنەوەو تەڕ کردنەوەی دار سیواکەکە سوودی گەورە هەیە، چونکە ووشکی ڕیشاڵەکان دەبێتە هۆی داڕووشانی پدوو (پووك)و شانەی دەوری ددانەکان لە سەرەتای سیواك کردندا.

لەو بەڵگانەی کە دەبێ سیواکی یەکێکی تر بەکاربهێنی ئەو فەرموودەیە کە بوخاری دەری کردووە لە فەرموودەی (عبدالله ی کوڕی عمر) (خوا لێیان ڕازی بێ). کەوا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((أراني أتسوك بسواك فجاءني رجلان أحدهما أكبر

[1] تەماشای کتێبی (السواك و العناية بالأسنان) لاپەڕە (١٩٨) بکە.

من الآخر فناولت السواك الأصغر منها فقال لي: كبر، فدفعته إلى الأكبر منها)).[1]

بینیمیان سیواکم دەکرد، دوو پیاو هاتنه لام یەکیان گەورەتر بوو لەوی تر، سیواکەکەم دا بە بچووکەکەیان، پێ ی گوتم: بیدە بە گەورەکە، منیش دام بە گەورەکە.

لە کۆی ئەوانەی باسمان کرد دەرکەوت دەبێ سیواك ی جگە لە هی خۆت بەکاربێنیو ناپەسەند نیە، لە ئەدەبیشە گەورەکان وە پێش ئەوانی تر خەی لە کۆمەڵێکداو بەو دەست پێ بکەی، سوننەتیشە ئەمە بەکاربهێنی لە سەلام کردنو خواردنەوەو بۆن لێدانو شتی تر لە کاروباری دی دا (خوا زاناترە).

## یازدەهەم: ئایا دەبێ سیواك بە زماندا بێنی؟:-

زانایان دەڵێن: سوننەتە بابای موسڵمان سیواك بە زمانیدا بێنێ لەبەر ئەوەی پاك کردنەوەی ڕووی سەرەوەی زمان زۆر گرنگە، لەبەر هەبوونی وردە مەمیلەو کەلێن کە پاشماوەی تێدا

---

[1] البخاری لە دەست نوێژ (باب دفع السواك إلى الأكبر) (١/٤٢٥) ژمارە (٢٤٦). مسلم لە (زهد) باب مناولة الأكبر (١٨/١٧٤) ژمارە (٣٠٠٣) (نووی).

کۆدەبێتەوە، ڕەنگە کەلێنی قوڵی زگماکی تێدا هەبێ و ببێتە پەناگەیەك بۆ میکرۆبەکان و پاشماوە، لەبەر ئەوە وا باشە بە سیواك پاك کرێتەوە، هەروەها پان کردنەوەی زمان چالاکی شانەکان زیاد دەکا لەبەر ئەوەی شێلانی سووك بە سیواك فشارێك دەخاتە سەر مولولە خوێنەکان و لەوێوە خوێن بۆ لوولە گەورەکان دەڕوات، بە لابردنی ئەو فشارە دووبارە پڕ دەبێتەوە لە خوێن و بەو شێوە دووبارە دەبێتەوە و سووڕانی خوێن چوست دەبێ و نەرمی موولوولەکانی خوێن زیاد دەبێ و خوێنیشی زیاتر بۆ دەچێ.

پێغەمبەر (ﷺ) بەر لە هەزارو چوارسەد ساڵ فێری کردووین چۆن سیواك لەسەر زمان بکەین.

لە (ئەبی بەرەدەوە) لە باوکی دەگێڕێتەوە دەڵێ: ((أتينا رسول الله (ﷺ) نستحمله، فرأيته يستاك على لسانه، و قد وضع السواك على طرف لسانه و هو يقول: ((إه إه)) يعنى يتهوع)).[1]

---

[1] (أبوداود) لە (الطهارة) (باب كيف يستاك ٧٦/١) عون العبود. يتهوع: ڕشانەوە واتە دەنگێك وەك دەنگی ڕشانەوە، بۆ (مبالغە) بەکاردێ (فتح البارى ٤٢٤/١).

واته: هاتینه لای پێغەمبەر (ﷺ) داوای وولاغێکمان لێ کرد بۆ سواری دیتم سیواکی دەکرد لەسەر زمانیو سیواکی لەسەری زمانی دانابوو هێڵنجی دەهاتێ (دەنگی ڕشانەوە)ی لێ دەهات.

بوخاری دەری هێناوە بە وتەی: ((أتيت النبي (ﷺ) فوجدته يستن بسواك بيده يقول: ((أُع أُع))[1] و السواك فيه كأنه يتهوع)).[2]

واته: هاتمە لای پێغەمبەر (ﷺ) بینیم سیواکێکی بە دەستەوە بوو سیواکی دەکردو دەیگوت: ئوع ئوع وەك بڵێی بڕشێتەوە. موسلیم بە ووتەی: ((دخلت على النبي (ﷺ) و طرف السواك على لسانه))[3] دەری کردووە. واته: چوومە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەری سیواکەکە لەسەر زمانی بوو.

نەسائیش بە ووتەی: ((دخلت على النبي (ﷺ) و هو يستن و طرف السواك على لسانه و هو يقول: ((عأ عأ)) بتقديم العين على الهمزة الساكنة)) دەری کردووە. واته: چوومە لای

---

[1] ((أُع أُع)) زەممە لەسەر هەمزەو عەین ساکینە، دەنگی گەروو کاتێ کە سیواکی لەسەر ڕووی زمانی دانا. فتح الباري (٤٢٤/١).

[2] بوخاری دەری هێناوە لە (الوضوء باب السواك ٤٢٣/١ ژمارە (٢٤٤)).

[3] موسلیم لە (الطهارة باب السواك ١٤٤/٣ نووی) دەری کردووە.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) سیواکی دەکرد سەری سیواکەکە لەسەر زمانی بوو دەیگوت: (عەء، عەء).

(أحمد)یش لە فەرموودەی (أبی موسا)ی دەرهێناوە دەڵێ: ((دخلت على النبي (ﷺ) و هو يستاك و هو واضع طرف السواك على لسانه يستن إلى فوق)).[1]

واتە: چوومە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) سیواکی دەکردو سەری سیواکەکەی لەسەر زمانی دانابوو بۆ سەرەوە سیواکی پێ دەکرد.

شێخی سەعاتچی دەڵێ: ئەو فەرموودانە ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە سیواك کردن لەسەر زمان بە باری درێژی دەبێ‌و سیواکیش تایبەت نیە بە ددان‌و بەس‌و هەروەها بۆ پاك ڕاگرتنە نەك تەنها بۆ لابردنی پیسی لەبەر ئەوە پێغەمبەر (ﷺ) تەنها سیواکی ددانی پێ نەکردووە.[2] خواش زاناترە.

---

[1] أحمد (٤١٧/٣).

[2] الفتح الرباني (٢٩٦/١).

**دوازده‌هه‌م:**

## ئه‌و فه‌رمووده‌انه‌ی له‌ باره‌ی خێری سیواك كردن هاتووه‌:-

١- فه‌رمووده‌ی عائیشه‌ (خوا لێی ڕازی بێ) ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) فه‌رموویه‌تی: ((السواك مطهرة للفم مرضاة للرب)).[1]

واته‌: سیواك ده‌م پاك كه‌ره‌وه‌و خوا له‌خۆ ڕازی كه‌ره‌.

٢- زه‌یدی كوڕی خالد ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) فه‌رموویه‌تی: ((لولا أن أشق على أمتي لأخرت صلاة العشاء إلى نصف الليل و لأمرتهم بالسواك عند كل صلاة)).[2]

واته‌: ئه‌گه‌ر له‌سه‌ر ئۆمه‌ته‌كه‌م گران نه‌بایه‌ نوێژی عیشام دوا ده‌خست بۆ نیوه‌ی شه‌و، فه‌رمانم پێ ده‌كردن له‌گه‌ڵ هه‌موو نوێژێك سیواك بكه‌ن.

٣- ئه‌بوهوره‌یره‌ ده‌گێڕێته‌وه‌ كه‌وا پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) فه‌رموویه‌تی: ((لولا أن أشق على أمتي لأمرتهم بالسواك عند كل صلاة)).[1]

---

[1] (صحیح)ه‌ پێشتر ده‌رهاتووه‌

[2] (صحیح)ه‌، ترمذي له‌ (الطهارة باب ما جاء في السواك ١/٣٥) ژماره‌ (٢٣)و به‌ڕاستی داناوه‌، أحمد (٤/١١٤).

واتە: ئەگەر گران نەبوایە لەسەر ئۆمەتی من لە هەموو نوێژێك فەرمانم پێ دەكردن سیواك بكەن.

لە گێڕانەوەیەكی پێشەوا (أحمدو بوخاری) پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((لأمرتهم بالسواك مع كل وضوء)).

واتە: فەرمانم پێ دەكردن بە سیواك كردن لەگەڵ هەموو دەست نوێژێك.

٤- لە (مقدام كوڕی شورەیح) لە باوكیەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: بە عائیشەم گوت (خوا لێی ڕازی بێ): ((بأي شئ كان يبدأ النبي (ﷺ) إذا دخل بيته؟ قالت: بالسواك)).[٢]

واتە: كاتێ پێغەمبەر (ﷺ) هاتبایەوە ماڵێ بەچی دەستی پێ دەكرد، یان یەكەمجار چی دەكرد؟ فەرمووی بە سیواك.

٥- حوزەیفە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ((كان رسول الله (ﷺ) إذا قام من الليل يشوص فاه بالسواك)).[٣]

---

[١] پێشتر دەرهاتووە.

[٢] موسلیم لە (الطهارة ٣٢/١)، أبوداود (٥/١)، النسائي (١٣/١)، ابن ماجه (٢٩٠/١).

[٣] البخاری لە دەست نوێژ باب السواك (٨٨٩/٢)، مسلم لە (الطهارة ٤٦/١)، مانای شیوص: واتە دەیشواو پاكی دەكاتەوە، گوتراوە: دەیشێلێ.

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر شەو هەستاباوە دەمی بە سیواك پاك دەكردەوە.

٦- عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ((أن النبي (ﷺ) كان لا يرقد ليلاً و لا نهاراً فيستيقظ إلاّ تسوك)).[1]

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) شەو بوایە یان ڕۆژ نوستبایەو خەبەری بوایەتەوە هەر سیواكی دەكرد.

٧- ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((أكثرتُ عليكم في السواك)).[2]

واتە: زۆر باسی سیواكم بۆ كردن‌و شایستەی ئەوەشە زۆر باسی بكرێ.

٨- عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ((دخل عبدالرحمن بن أبي بكر و معه سواك يستن به، منظر إليه رسول الله (ﷺ) فقلت له أعطني هذا السواك يا عبدالرحمن، فأعطانيه، فقضمته ثم

---

[1] أبو داود لە (الطهارة باب السواك ١/٥٧)، أحمد (٦/١٢١).

[2] بوخاری لە (الجمعة باب السواك يوم الجمعة ٢/٤٣٥) ژمارە (٨٨٨).

مضغته، فاعطيته رسول الله (ﷺ) فاستن به و هو مستند إلى صدري)).[1]

واتە: (عبدالرحمن)و کوڕی ئەبوبەکر هاتە ژوورەوەو سیواکێکی پێ بوو سیواکی دەکرد، پێغەمبەر (ﷺ) سەیری کرد، پێم گوت: ئەی عبدالرحمن سیواکەکەم بدەرێ، کرۆژتمو جوییمو دام بە پێغەمبەری خواو سیواکی پێ کردو سەری بە سنگی من کردبوو.

٩- ئەبو موسا (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ((دخلت على النبي (ﷺ) و طرف السواك على لسانه)).[2]

چوومە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) دیتم سەری سیواکەکەی لەسەر زمانی بوو.

١٠-(ابن عباس) (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ((أنه بات عند النبي (ﷺ) ذات ليلة فقام النبي (ﷺ) من آخر الليل فخرج فنظر في السماء ثم تلا هذه الأية في آل عمران: ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ﴾... حتى بلغ ﴿فَقِنَا عَذَابَ

---

[1] البخاری له (الجمعة باب من تسوك بسواك غيره) (٤٣٨/٢) ژماره (٨٩٠).

[2] مسلم (١٤٤/٣) به ڕاڤەی نەوەوی.

ﭐلنَّارِ﴾ سورة آل عمران: (١٩٠-١٩١) ثم رجع إلى البيت فتسوك و توضأ ثم قام فصلّى، ثم آضطجع، ثم قام فخرج فنظر إلى السماء فتلا هذه الآية، ثم رجع فتسوك فتوضأ ثم قام فصلّى)).[١]

واته: شەوێك (ابن عباس) لەلای پێغەمبەر (ﷺ) مایەوە بینی پێغەمبەر (ﷺ) لە كۆتایی شەو هەستایەوەو چووە دەرەوەو سەیری ئاسمانی كردو ئەم ئایەتەی خوێندەوە (بەڕاستی لە بەدیهێنانی ئاسمانەكانو زەوی‌و جیاوازی شەوو ڕۆژ... تا گەیشتە (سا لە سزای ئاگر بمان پارێزە). آل عمران: (١٩٠-١٩١) ئینجا گەڕایەوە ماڵەوەو سیواكی كردو دەست نوێژی گرت‌و هەستا نوێژی كرد، ئینجا پاڵی دایەوە، دوایی هەستایەوەو دەرچوو سەیری ئاسمانی كردو ئەو ئایەتەی خوێندەوە، ئینجا گەڕایەوەو سیواكی كردو دەست نوێژی شوشت‌و هەستاو نوێژی كرد.

١١-فضل ی كوڕی عباس دەڵێ: ((لم يكن النبي (ﷺ) يقوم إلى الصلاة بالليل إلاّ استنّ)).[٢]

---

[١] مسلم لە سەرچاوەی پێشوو.

[٢] الطبراني لە (الكبير ٢٩٧/١٨) ژمارە (٧٦٣).

واتە: هەر کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) شەو هەستابایە، هەر سیواکی دەکرد.

١٢- عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە دەڵێ: ((أنّ النبي (ﷺ) كان يوضع له سواكه و وضوؤه، فاذا قام من الليل تخلّى ثم إستاك)).[1]

واتە: پێغەمبەری خوا سیواك و ئاوی دەست نوێژمان بۆ دادەنا، جا ئەگەر شەو هەڵسابایەوە لە خەو دەستی بە ئاو دەگەیاندو ئینجا سیواکی دەکرد.

١٣- موعاویە دەڵێ: ((أمرني رسول الله (ﷺ) الاّ آتى أهلي في غرّة الهلال، و أن أستنّ كلما قمت من سنتي)).[2]

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێ کردووم کە لە سەرەتای مانگی هیلالی (١،٢،٣)ی مانگ نەچمە لای خێزانم و هەرکاتێك لە خەو هەستام سیواك بکەم.

---

[1] أبوداود له (الطهارة باب السواك لمن قام من الليل ١/١٥) ژمارە (٥٦) و صححه إبن منده.

[2] الطبراني (٣٤٩/١٩) ژمارە (٨١١)و أحمد دەری کردووە لە (ابن عمر ١١٧/٢) لە صفوان ی کوڕی معطل (٣١٢/٥).

١٤- ئەبی ئەیوب دەڵێ: ((قال رسول الله (ﷺ): أربع من سنن المرسلين: الختان و السواك و التعطر و النكاح)).[١] الطبراني له (المعجم) له فەرموودەی (ابن عباس) گێڕاویەتیەوە.[٢]

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: چوار شت له سوننەتی پێغەمبەرانە: سونەت کردن‌و سیواك کردن‌و بۆن لەخۆ دان‌و ژن هێنان.

١٥- ئەبوهورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ((قال رسول الله (ﷺ) الطهارات أربع: قص الشارب، و حلق العانة، و تقليم الأظفار و السواك)).[٣]

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: پاکیەکان چوارن: سمێڵ بڕین (کورت کردنەوە)، بەر تراشین، نینۆك کردن، سیواك کردن.

---

[١] الترمذي له (النكاح باب في فضل التزويج ٣٩١/٣) ژمارە (١٠٨٠) به (حسن)ی داناوە، أحمد (٤٢١/٥)، عبدی کوڕی حەمید له المنتخب لاپەڕە (١٠٣)، أبو الليث السمرقندی له (تنبيه الغافلين) لاپەڕە (٣٨٩)، سەیری (فيض القدير) (٤٦٦/١)، الجامع الصغير هي سيوطي (٩٢/١) ژمارە (٩١٩).

[٢] المعجم الكبير (١٨٦/١١) ژمارە (١١٤٤٥) بەڵام بە وتەی (خمس من سنن المرسلين).

[٣] کورتەی (زوائد المسند) (٦٦٨/١) ژمارە (١٢٢٥).

١٦-عائیشه (خوا لێی ڕازی بێ) دەفەرموێت: ((كان النبي (ﷺ) اذا سافر حمل السواك و المشط... الحديث)).[١]

واتە: ئەگەر پێغەمبەر (ﷺ) چووبا بۆ سەفەر سیواك و شانەی هەڵدەگرت.

١٧-لە عائیشەوە (فەرموودەكەی بەرز كردۆتەوە) دەڵێ: ((فضل الصلاة التي يستاك لها على الصلاة التي لا يستاك لها سبعين ضعفاً)).[٢]

واتە: خێری ئەو نوێژەی سیواكی تێدا دەكەی لەگەڵ ئەو نوێژەی سیواكی تێدا ناكەی حەفتا قاتە.

١٨-لە جابرەوە (خوا لێی ڕازی بێ) دەفەرمووێ: ((إذا قام أحدكم من الليل يصلى فليستك، فانه إذا قام يصلى أتاه ملك، فيضع فاه على فيه فلا يخرج شئ من فيه، إلاّ وقع في الملك))

---

[١] لاوازە (ابن ماجه) لە (الطهارة) (١/١٢٩) ژمارە (٣٦١)، العقيلى لە لاوازەكان (٤/٧٣).

[٢] لاوازە: أحمد (٦/٢٧٢)، ابن خزيمة (١/٧١) ژمارە (٣٧)، الباني بە لاوازی داناوە لە (السلسلة الضعيفة) (١٥٠٣).

حافظ إبن حجر دەڵێ: ئەبو نعیم گێڕاویەتیەوەو پیاوەکانی جێ بڕوان، ابن دقیق العید وای گوتووە.[1]

١٩-عائیشە دەگێڕێتەوە (فەرموودەکە بەرز دەکاتەوە) دەڵێ: ((ثلاث هن لكم سنة و عليّ فريضة السواك و الوتر و قيام الليل)).[2]

واتە: سێ شت بۆ ئێوە سوننەتەو بۆ منیش فەرزە: سیواك کردن، نوێژی (ویتر)، شەو نوێژ.

٢٠-لە (ابن عمر)ەوە (خوا لێی ڕازی بێ) دەفەرموێت (فەرموودەکە بەرز دەکاتەوە): ((أراني أتسوك بسواك، فجاءني رجلان أحدهما أكبر من الآخر فناولت السواك للأصغر منهما، فقيل لي: كبر)).[3]

[1] بکەڕیوە بۆ (تلخيص الحبير) (١١٢/١).

[2] أبوداود (١٢/١) ژمارە (٤٨)، إبن خزيمة (٧٢،١١/١) ژمارە (١٥)، (١٣٨) سەنەدەکەی (حسن)ە، حاكم (١٥٦/١)، بيهقي (٣٧/١-٣٨).

[3] البخاری لە (الوضوء باب دفع السواك إلى الأكبر ٤٢٥/١) ژمارە (٢٤٦) موسلیم بە ڕاڤەی نەوەوی (كتاب الزهد باب مناولة الأكبر ١٧٤/١٨) ژمارە (٣٠٠٣).

واتە: بە سیواك سیواکم دەکرد، دوو پیاو هاتنە لام، یەکیان لەوی دی گەورەتر بوو، سیواکەکەم دا بە بچووکەکەیان، پێ یان گوتم لە گەورەکەوە دەست پێ بکە.

٢١-لە عەلیەوە دەڵێ (فەرموودەکە بەرز دەکاتەوە): ((إن أفواهكم طرق للقرآن فطهروها بالسواك)).[1]

واتە: دەمتان ڕێگەی قورئان خوێندنە، جا بە سیواك پاکی کەنەوە.

٢٢-لە عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێ) دەفەرموێت: ((كان رسول الله (ﷺ) اذا دخل بيته يبدأ بالسواك)).[2]

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر هاتبایەماڵەوە سەرەتا بە سیواك کردن دەستی پێ دەکرد.

٢٣- لە (ابن عباس)ەوە ئەویش فەرموودەکە بەرز دەکاتەوە دەفەرموێت کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((السواك يذهب البلغم و يفرح الملائكة و يوافق السنة)).[1]

---

[1] ابن ماجه لە (الطهارة باب السواك ١٠٦/١) ژمارە (٢٦١) ڕاوەستاوە (موقوفاً) سەنەدەکەشی (لاوان)ە.

[2] (إبن حبان) (٢٠٤/٢) ژمارە (١٠٧١) ((إحسان)) بنچینەکەی لە صحیح ی موسلیم هەیە لە (الطهارة) باب السواك (١٨٢/٣-١٨٣) بە ڕاڤەی نەوەوی.

واته: سیواك كردن بەڵغەم لادەباو فریشتە دڵخۆش دەكاو لەگەڵ سوننەتیش ڕێك دێ.

٢٤-لە ئەبی خەیرەوە دەڵێ: ((كان النبي (ﷺ) يستاك بالأراك، فأن تعذر عليه استاك بعراجين النخل، فان تعذر استاك بما وجد)).[٢]

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) بە داری ئەراك سیواكی دەكرد، ئەگەر دەستی نەكەوتبایە لقە چەماوەكانی دارخورمای بەكاردەهێنا، ئەگەر هەر نەبوو هەر شتێك هەبووایە سیواكی پێ دەكرد.

٢٥-لە موعازەوە كە فەرموودەكە بەرز دەكاتەوە دەڵێ: ((نعم السواك الزيتون من شجرة مباركة، يطيب الفم و يذهب الجفر، و هو سواكي و سواك الأنبياء قبلي)).[١]

---

[١] ابو نعیم گێڕاویەتیەوە، هەروەك حافظ ئیبنو حەجەر لە (تلخيص الحبير) (١/١١٩) باسی كردووە.

[٢] البخاری لە (التأريخ الكبير) (٨/٢٨) ژمارە (٢٣٥)، الطبراني لە (الكبير ٢٢/٣٦٨) ژمارە (٩٢٣).

واتە: باشترین سیواك زەیتونە لە دارێكی پیرۆزە. تامی دەم خۆش دەكاو ناخۆشی لادەبا، سیواكی من‌و پێغەمبەرانی پێش منە.

## سیازدەهەم: سیواك‌و زانستی نوێ:-

یەكەم شت كە پیاوانی زانست پێمان بڵێن دەربارەی سیواك ئەوەیە لە دارێك دروست دەكرێ تایبەتەو سەر بە تیرەی (فصیلة) سلفادۆریە بە ئاراك دەناسرێ‌و ناوە زانستیەكەی (سلفادۆرا بەرسیكا)یە. ئەمەش سیواكی پێغەمبەرە (ﷺ) داری ئەراك لە دۆڵەكانی بیابانیدا هەیەو كەمتر لە چیاكان هەیە، بەڵام كەش‌و هەوای گەرم‌و كەمەرەیی كەشێكی نموونەیی یە بۆ گەشەی. لەبەر ئەوە لە شانشینی سعودیە زۆرە وەك ناوچەی عەسیرو ئەبهاو جیزان‌و هەروا لە سودان‌و یەمەن‌و ئێران‌و رۆژهەڵاتی هیند، لە هەندێ لای میسر وەك (وجه القبلی)و سینا.

ئەراك دەوەنی جوان‌و بەردەوام سەوزە بە درێژایی ساڵ، بەژن كورتە، تیرەی قەدەكەی لە یەك پێ زیاتر نیە، لایەكانی

---

[1] طبراني لە (الأوسط) دەری كردووە (١/٤٠)، سەیری (مجمع البحرین) بكە ژمارە (٧٨٤)، دەڵێ: لە سەنەدەكەی (أحمد كوڕی محمد كوڕی محص) هەیە تەنها لە (ابراهیم ی كوڕی أبی عەبلە)ە لێ ی گێڕدراوەتەوە.

تەشیلەیین گەلاكانی ڕوو بریسكەدارن، گولێكی ڕەنگ زەردەو تێكەڵ بە سەوزە لە گوڵەكەی بەرێك پەیدا دەبێ دەخورێ، بە قەد دەنكە نۆكێك دەبێ. ئەمە وەسفی داری ئەراكە، ئەی دەربارەی سیواك چی هەیە؟ ئەم سیواكە لە ڕەگی دارەكە وەردەگیرێ، كاتێ دوو ساڵە بێ یا سێ ساڵە، جار وایە لە لقەكانیشی وەردەگیرێ، كاتێ وشك یا تەڕ بێ بۆن‌و تامێكی خۆش‌و جیاكەرەوەی هەیە، بەڵام هەر دەبێ وشك كرێتەوەو لە جێگایەك هەڵبگیرێ شێ ی نەگاتێ، تا بۆ بەكارهێنان دەهێنرێتە دەرەوە.

بۆ بەكارهێنانی دەبێ سەرێكی بخەیتە ناو ئاو تا نەرم دەبێتەوە ئینجا توێكڵەكەی لادەبەی بە قەد ئەوەی دەتەوێ بیكەی بە فڵچەیەك نزیكەی (١-١,٥)سم بێ ئینجا ئەو بەشە لەسەرەوەڕا شەقی دەكەی‌و ئینجا وردی دەكەی‌و تاڵەكانی لە یەك دوور دەكەیەوە تا وەك فڵچەیەكی ددانی لێ دێ. ئەگەر دەتەوێ ورد بێ دەكرێ بڵێ ی باشترین‌و تەواوترین فڵچەیە مرۆ ناسیبی، ئەمەش قسەیەكە خۆمان ڕەواجی پێ نادەین بەڵكو زاناكان سەلماندوویانە لە بن میكرۆسكۆب كاتێ برگەیەكی بە پانی دەپشكنن.

## سیواك لە بن میکرۆسکۆپی زاناکانی کیمیا:

ئەمە سیواکەو لەپێش پشکنەران دەردەکەوێ، وەك بلێی خوای گەورە بە باشترین شێوەی ئامادە کردووە بۆ پاك کردنەوەی ددان و پاراستنی دەم، لە برگەی پانییەکەیدا سێ چینی لە دوای یەك دیاردەکەوێ: یەکێکیان شانەی تەپەدۆریەو دووەم شانەی دارینە، هەردووکیان بەشی دەرەوەی پارێزەری بەشی ناوەوە پێك دێنن کە ریشاڵەکانی تێدایەو لەوێ جوانی بیناسازیەکە دەردەکەوێ. ریشاڵەکان بە سیستەمێکی ورد ریز بوون لەپاڵ یەك، لە هەر گوریزەیەك ریشاڵۆکەی باریك هەن تا بە هەموویان باشترین فڵچە دروست دەکەن بە شاهێدی پسپۆرەکان. باوەڕ دەکەی؟ تا ئێستا شارەزایانی دروست کردنی فڵچەی ددان دەیانەوێ لاسایی سیواك بکەنەوە. وەك فڵچەیەك، هەوڵدەدەن سوود وەرگرن لە ریشاڵە سەرسوڕهێنەرەکانی بۆ دروست کردنی تاڵی فڵچەکانیان.

پوختەی قســــان: لە ڕووی دامەزراندنیەوە باشترین پاکەرەوەی میکانیکیە، بۆ تەندروستی پووك (پدوو)و ددان و دەم هیچ شتێکی میکانیکی نیە هاوتای سیواك بێ وەك تۆژەرەوەی نەخۆشیەکانی دەم و ددان باسی دەکەن.

### ترسناکی دەم پێی دەڵێن ( پلاك ):-

دوای ساڵانێکی دوورو درێژ توێژەرەوانی نەخۆشی دەمو ددان بەسەریان برد لە دوای هۆیەکانی نەخۆشی دەمو ددان گەیشتنە سێ ڕستەی زێڕین وا لە خوارەوەن:

١- بە نەبوونی پلاك ددان تووشی کلۆر بوون نایە.

٢- پووك (پدوو) تووشی هەوکردن نایە بە نەبوونی پلاك.

٣- دەمو ددانو پدوو تەندروست نابن بە لانەبردنی پلاك.

بەڵام پلاك چیەو ترسناکی لە چیدایە؟ و کێ دەتوانێ لایداو چی هەیە لەسەر سیواكو پلاك؟ پرسیار گەلێکن پێویستیان بە وەڵام هەیە، بەڵام دەبێ بزانی لە دەمی منو تۆدا ژمارەیەکی زۆر بەکتریا هەن، هەندێك ژماردوویانەو بە (٥,٥) ملیۆن خانەیان داناون لە هەریەك سانتیمەتر سێجا یەکی لیکدا. لیك یش وەك منو تۆ دەزانین ئەو شلەیە کە زمان بەردەوام تیایدا مەلە دەکا بە شێوەیەك هەر ددانێك بە چینێکی تەنك لە لیك دادەپۆشرێ، گرنگ ئەوەیە بەکتریاکان بێ جووڵە نین بەڵکو جووڵاوو گورجو گۆڵن بەتایبەتی لە کاتی هەبوونی پاشماوەی شەکرەکان لە کەلێنی ددانەکان، یەکسەر دەست پێ دەکا بە دروست کردنی گەردیلەی درێژ لە مادەی جەلاتینی بەهێز بە ڕووی ددانیەوە

دەنوسێنن، هەروەك پێشبینی دەكرێ كە ملیۆنەها بەكتریای تێدا دەژی، گەشەو ژمارەیان زیاد دەكا لەكەیەكی میكرۆبی وەك چینێكی سپی دروست دەكا (Bacteria Plaque) وەكو چینێكی تەڕی لینجی ڕەنگ مەیلەو سپی دەردەكەوێ، هەندێ كاتیش بێ ڕەنگە، ژمارەیەكی زۆر بەكتریا دەگرێتە خۆی بە (۳۰۰) ملیۆن خانە لە هەر میللیگرامێكدا مەزەندە دەكرێ (میللیگرام یەك بەش لە ۱۰۰۰ بەشی گرام ە). كەوایە ترسناكی ڕاستەقینە بەرەو ددان دێ. هەندێ تۆرەمەی (سلالە)ی بەكتریای پلاك هەن وەك: ( Striptococci a Lactobacill us a Actinomy) بەردەوام دەبن تا ددان كلۆر دەكەن. شتێكی گرنگەو ئاسان نیە، لە سەرەتاوە ئەنزیمی تایبەت دەڕێژن بۆ هەرس كردنی پاشماوەی شەكر بۆ گۆڕینیان بۆ شەكری سادەتر وەك گلوكۆز بەردەوام دەبن تا كۆمەڵێك ترشی ئەندامی وەك لاكتیك‌و پیرۆفیك‌و خەلیك‌و پرۆپیۆنیك پێك دێنن. شاراوە نیە كە ئەو ترشانە توانای تواندنەوەی بەشی ڕەقی مینای كاكیلەیان هەیەو بۆشایی كلۆری ترش دروست دەكەن، لەوێوە ڕووی كاكیلە دەست بە داخوران دەكاو ڕێ خۆش دەكا بۆ چوونە ژوورەوەی شەپۆلێكی دیكەی بەكتریا بۆ قولاییەكی

دوورتر، تا ڕووخانەکە بە مردنی خانە زیندووەکانی کاکیلە کۆتایی دێ‌و لەلای ڕەگەکەیەوە کێم‌و زووخاو دروست دەکات.

ئێستا ئەو کەسە ڕاستی گوتووە کە دەڵێ: بێ پلاك ددان کلۆر نابێ. یان بە شێوەیەکی تر ((خۆپاراستن نیە دژی کلۆر بوونی ددان بێ لادانی پلاك)) بەڵام کێ پلاکی لادەبا؟ با وەلام تۆزێ دوا بخەین تا تەماشای یاسای زێڕینی دووەم بکەین کە دەڵێ: ((بێ پلاك هەوکردنی پووك ڕوونادا)) ڕاستە؟ بەڵام مانای چی یە؟ ڕاستیەکەی چینە نەرمەکەی پلاك ئەگەر پشت گوێ خرا، هەندەی پێ ناچێ کەمێ ڕەق دەبێ لە ماوەی (١٢-٢٤) سەعات زەحمەت بە فلّچەی ددان لادەچێ، لەگەڵ تێپەڕبوونی ڕۆژ ڕەقی زیاد دەبێ ئەگەر بەردەوام پشت گوێ خرا، تا دەبێ بە نیشتوویەکی جیڕی بەهێز، ئەمەش بەردەوام لەگەڵ ئەو خۆراکانەی لێرەو لەوێ دەمێننەوە دەست تێکەڵ دەکەن لەسەر ڕووی ددانەکان‌و تا کودەتایەك دەکەن ئەویش ڕوودانی هەوکردنێکی سادەیە لە پووك دا. ڕاستە سادەیە بەڵام لەگەڵ تێپەڕبوونی کات‌و پشت گوێ خستن شتێکی کتوپڕ دەبینی، کە بەرە بەرە بەرەو ئەو شانە تەنکانەی کە ددان دەچەسپێنن لە جێ ی خۆی دەچێ، ئەوەی ڕەگی ددان بەو شەویلاگەی دەوری داوە دەبەستێ، ئینجا هەو کردنەکە توندتر دەبێ‌و هۆشداری

دەدا بە داخورانێکی توند تووشی ئێسك دەبێ. بەشەکانی کودەتاکە بە باشترین شێوە تەواو بوو، دوای کەمێکی دی مۆڵگەیەکی کێمو زوخاوی بۆگەن لە نێوان ڕەگی ددانو ئێسك دروست دەبێ. پڕە لە تێکەڵی زووخاوو خانەی مردووو وردە گیاندارو پاشماوەی خۆراك تا مرۆ تووشی (بیوریا) دەبێو ڕەنگە تووشی لەدەست دانی ددان ببێ، پێش کەوتنی ددانیش لەش تووشی مەترسی دەبێ، زوخاوی بۆگەن شەوو ڕۆژ لە دەمی دەمەیێو لە دەمەوە بەرەو بەشەکانی دی کۆئەندامی هەرس دەچێو نەخۆشی دەکا، زۆر جار بەکتریای کێمو زوخاوەکە بە ژەهرەکانیانەوە بەرەو بەشەکانی لەش دەچێ لە ڕێی تەوژمی خوێنەوە. چەند کۆتاییەکی ناخۆشە. ڕووی نەدەدا ئەگەر پلاکەکە لادرابا، وا نیە؟ ڕاستە، کاتی ئەوە نەهاتووە شتێك دەربارەی ئەوە بزانین پلاك لادەبا؟.

## سیواك لە ڕووی پلاك دا:

توێژەری پزیشکی ئەڵمانی (فریدریك فیستەر) توێژەرێکی ڕەسەنو خۆنەویست بووە، ساڵانێکی زۆری بەسەر بردووە پێش ئەوەی وەلامی ئەو پرسیارەمان بداتەوە، ئەوە خۆیەتی دەڵێ:- چارەسەری گرێ کوێرەی پلاك ناکرێ بێ پاك کردنەوەی

میکانیکی ددان چەند جارێ لە ڕۆژێکدا. ئەوە باشترین چارەسەرە بۆ تەندروستی دەم‌و ددان. ئینجا دەڵێ‌و بۆمبێکی زانستی پێشبینی نەکراو دەتەقێنێتەوە: من خۆم لە ماوەی حەوت ساڵی دوایی دا بۆ پاك کردنەوەی ددانەکانم بێ هەویری ددان بە تەنها فڵچەم بەکارهێناوە. دەتوانم بە هەموو دڵنیاییە‌وە بڵێم پدووو ددانم هیچ ڕۆژێك لە ڕۆژان لەوڕۆ باشتر نەبووە. نە هەو کردن‌و نە کلۆر بوونم هەیە. بەڵێ فڵچەی ددانی ئاسایی ئەو کارە دەکا بەتەنێ! دەبێ فڵچەی ددانی نموونەیی کە بە سیواك ناسراوە چی بکا؟ شتەکە سەرسوڕهێنەرە بێ گومان. بەڵام شتێکی لەناکاو چاوەڕێمان دەکا کاتێ بە قووڵی لە گوتەی پرۆفیسۆر (فیستەر) دەربارەی پاك کردنەوەی میکانیکی ددان چەند جارێك لە ڕۆژێکدا دەڕوانین‌و وردیش دەبینەوە لەو ئامۆژگاریەی پێغەمبەری خوا پێی گوتوین. مرۆ چی بەدەستەوە نامێنێ لە واق‌ووڕمان زیاتر. مەگەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی پێ نەکردووین بە بەکاهێنانی سیواك (کاتێ کە باشترین پاکەرەوەی میکانیکیە) چەند جارێك لە ڕۆژێکدا، کەمترینیان پێنج جارە لە ڕۆژێکدا وەك لە فەرموودەی مەشوردا هاتووە:

((لولا أن أشق على أمتي لأمرتهم بالسواك عند كل صلاة))[١]
واتە: ئەگەر گران نەبا لەسەر ئۆمەتەکەم فەرمانم پێ دەکردن لە هەموو نوێژێك سیواك بەکاربێنن. با تێڕوانینێکی زانستیانەی گشتی لە فەرموودەکە بڕوانین، بەتایبەتی لێکۆڵینەوەی توێژەرەوەکان دەردەخەن کە بە ماوەیەکی کەم دوای پاك کردنەوەی ددان بەکتریا کۆ دەبنەوە. بەو جۆرە ئامۆژگاریەکە وایە چەند جارێك سیواك بکەین لە ڕۆژێکدا بۆ قوتار بوون لە کۆمەڵی میکرۆبەکان و لابردنی چینی پلاك کە هێشتا نەرمەو ڕەق نەبووە. شتێکی دی دەبێ بیلێین، توێژەرەوەکان دەڵێن دەبێ لە کۆبوونەوەی لیك (وەك لە کاتی خەو ڕوودەدا) نیشتنی پەڵەی میکرۆبی چالاك دەکا ڕەنگە ئەوەی کە لە پێغەمبەرەوە هاتووە (ﷺ) کە زۆر بە پەرۆش بووە بۆ سیواك کردن کاتێ شەو هەڵدەستایەوە، ئەمە ڕوون بکاتەوە. سا لە (صحیحین)دا لە حوذەیفەی کوڕی یەمان دەڵێ: ((کان النبي (ﷺ) اذا قام من الليل يشوص فاه بالسواك)).[٢]

---

[١] متفق علیە. (بوخاری و مسلم لەسەری ڕێ کەوتوون کە ڕاستە).

[٢] پێشتر دەرهاتووە.

واته: ئەگەر پێغەمبەر (ﷺ) لە شەو هەستابایەوە دەمی بە سیواك پاك دەكردەوە.

لە عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: ((أن النبي (ﷺ) كان لا يستيقظ من ليل أو نهار إلا تسوك قبل أن يتوضأ)).[1]

واته: پێغەمبەر (ﷺ) شەو بوایە یان ڕۆژ لە خەو هەستابایە پێش دەست نوێژ گرتن سیواكی دەكرد.

(إبن عمر) (خوا لێی ڕازی بێ) لە پێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە: ((أنه كان لا ينام إلا و السواك عنده فاذا استيقظ بدأ بالسواك)).[2]

واته: پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر نووستبایە سیواكی لای خۆی دادەناو كە خەبەری دەهات سیواكی دەكرد. ئایا دوای ئەمە هیچ بەهانە هەیە؟ فەرموودەكە هێشتا لە سەرەتاكەیدایە، دوای ڕاوەستانمان بەرابەر جوانی بینای سیواكەكە بە نەرمی بۆ

---

[1] أحمد (١٢١/٦)،(١٢٣)، (١٦٠).

[2] أحمد (١١٧/٢) لە سەنەدەكەی گێڕەرەوەك هەیە ناوی نەهاتووە، سەیری المجمع (٩٨/٢)، (٢٦٣) بكە.

تاقیگە بۆ پێکهاتەی سیواك و مادە کیمیایی یەکانی هەنگاو دەنێین.

## فلچەی سروشتی بەهێزی پاك کردنەوەی سێ یانە:

کەمێك لە خەڵکی دەزانن کەوا سیواك تاکە فڵچەیە هێزی پاك کردنەوەی سێ یانەی هەیە: هێزی میکانیکی و کیمیایی و زیندەیی. جا سیواك لە ڕووی (میکانیکیەوە) سوودی هەیە بۆ لابردنی پاشماوەی خواردنی کەلێنی ددانەکان هەروەك لەسەر ڕووی ددانەکان پیسی و ڕەنگ و مۆڵگەی میکرۆبەکان لادەبا. وەك باسمان کرد ئەمەش ڕێ دەکەوێ لەگەڵ سروشتی ڕیشاڵە سلیلۆزیەکان لەڕووی هێزو نەرمیەوە. ماوە هەندێ شت بزانین لە خاسیەتە کیمیایی یەکانی کە زۆرن و سەرسوڕهێنەرن لەوانە سیواك ڕێژەیەکی باشی فلۆراید تێدایە کە توخمێکی زیندەیی یە پتەوی و بەرگری بە مینای ددان دەبەخشێ دژی کاریگەری ترش لە کلۆر بوون.

ئەوەی خۆشە باسکرێ ئەوەیە توێژەرێك لە زانکۆی (گراتز)ی نەمساوی یەکەم کەس بوو ئەو ڕاستیەی سەلماند، کاتێ سەرنجی دا لە شی کردنەوەی مادەی (بازلت)ی ڕەق کە فلۆراید تاکە توخمە جیا لە مادەکانی دی نەرمە، بەو شێوەیە لە

هزری ئەودا بیرۆکەیەك کەڵاڵە بوو دەڵێ دەتوانرێ بەهۆی فلۆرایدەوە ددان بەهێز بێ. هەندەی پێ نەچوو بیرۆکەکە بڵاو بووەوە، وڵاتە پێشکەوتووەکان لە ڕووی تەندروستیەوە ئەو پلانە وەك شێوازێك پەیڕەو دەکەن بۆ پاراستنی گشتی دەم. توێژینەوەی توێژەرەوان دەریان خستووە کە زۆرینەی سوودمەندەکان لە پلانی فلۆراید منداڵانن. لەبەر ئەوەی ددانیان لە قۆناغی گەشەو دروست بووندایە. مینای ددانی بەردەوام لە هەشت ساڵی سەرەتای تەمەن دروست دەبێ. لەو قۆناغە فلۆراید بەرەو ددان دەچێ پێش گەشە کردن کاتێ جێگەی ئەو توخمانە دەگرێتەوە کە کەمتر کاریگەرن وەك سۆدیۆمو پۆتاسیۆم لەژێرخانی مینای دداندا، ئەو بەستەرە گەردیانەی مادە نوێیەکە دروستی دەکا زۆر بەهێزترە لەو بۆندانەی ئەو توخمانەی جێیان گیراوەتەوە دروستیان کردبوو ئەمەش وا دەکات ددان پتەو ترو بەهێزتر بێ. ئەوەی دەبێ بگوترێ ئەوەیە مادەی مینا لەو قۆناغە فلۆراید لە شێوەی (Hydroxapetite) دەگۆڕێ بۆ شێوەیەکی ڕەق تر کە ( Flouroaptite)ە. مرۆ دەبێ بیر کاتەوە کە منداڵانی ڕابهێنێ لەسەر بەکارهێنانی سیواك بەتایبەتی لە قۆناغی پێکهاتنی مینای ددان، بەدەرکەوتووە کە بەکارهێنانی فلۆراید لەسەر ددان بە

شێوەیەکی دروست بە ویستی خوا بە درێژایی تەمەن ددان لە کلۆر بوون دەپارێزێ. لێرە دەبێ ئاماژە بە ئاستی تەندروستی پێویست بکرێ کە ڕێکخراوی ددانی ئەمریکی و ئەکادیمیای پزیشکی منداڵان. ژەمی ڕۆژانەی پێویست لە فلۆراید (٠,٤٥) مللیگرامە تا دوو ساڵ، (٠,٥) مللیگرامە بۆ منداڵانی (٢-٣) ساڵ (١) مللیگرام بۆ سەرووی (٣) ساڵان تا تەمەنی پێگەیشتن (سن البلوغ). مانای وایە توانای فلۆراید بۆ پاراستنی ددان لە تەواو بوونی گەشەیدا ناوەستێ بەڵکو بەردەوامە لە ڕێی یارمەتیدانی دووبارە بنیاتنانەوەی ئەو بەشەی بەکتریاکان لەبەینی دەبەن پێش گەیشتن بە قۆناغی کلۆر بوون.[١]

لە ڕۆژنامەی (الوفد)ی میسری دا ئەو هەواڵەم خوێندەوە:

لە بن ناونیشانی (هۆشداریەکی بەریتانی، فلۆریدی ددان تووشی خەمۆکی و لاوازی ئێسکت دەکات).

دەقی هەواڵەکە: ((لە نێو ئاپۆرای ڕاگەیاندنەکاندا لەبارەی سوودی هەویری ددانی دروست کراو لە فلۆراید، سەنتەری تەندروستی لەندەن هەستا بە ڕێکخستنی هەڵمەتێکی

---

[١] سەیری گۆڤاری (المنهل)ی دەرچوو لە مانگی ڕەمەزانی پیرۆز بکە ساڵی ١٤١٧ی ك (١٩٩٧)ی ز.

تەندروستی تیایدا هۆشداری دەدا لە بەکارهێنانی فلۆراید لەبەر ئەوەی زیانی لاوەکی لە ددان دەداو دەبێ بەهۆی تووش بوون بە نەخۆشی سستی کۆئەندامی بەرگریو لاوازی ئێسكو ڕەق بوونی جومگەکان،و هیلاکی بەردەوامو خەمۆکی، سەنتەرەکان ناویان لەو هەڵمەتە نا (نا بۆ فلۆراید).

سەنتەرەکان دەریان خست کە بەکارهێنانی مادەی فلۆراید، زیاتر لە ڕێژەی ڕێ پێدراوی زانستی دەبێ بەهۆی دەرکەوتنی پەڵەی قاوەیی لە ددانی منداڵاندا، سەنتەرەکان ئاماژەیان بەوە دا کە زیانەکانی فلۆراید لە بڕی بەکارهێنانیەتی نەك لە مادەکە خۆی. سەبارەت بە گەورەکان زیانی فلۆراید ناگا بە ددان لەبەر تەواو بوونی گەشەی بەڵکو دەبێ بە هۆی دەرکەوتنی نەخۆشی خەمۆکیو نەمانی نەرمی ئێسك بەهۆی کۆبوونەوەی فلۆراید لەسەری ئەویش دەبێتە هۆی ڕەق بوونو ئاسان شکان.

## گەڕانەوە بۆ تاقیگە:

جگە لە فلۆراید مادەی (سیلیس) لە سیواکدا هەیە ڕێژەکەی دەکاتە (٤٪) ئەویش یەکێکە لەو مادە خلیسکێنەرانە کە توانای خاوێن کردنەوەی هەیە، چینی پلاك لادەباو ددانی لێ پاك دەکاتەوە هەروەها مادەی بیکاربۆناتی سۆدیۆم هەیە کە

کۆمەڵگەی چارەسەری ددانی سەر بە کۆمەڵەی پزیشکانی ددانی ئەمریکی ئامۆژگاری کرد بۆ هەویری ددانی زیاد بکەن. شی کردنەوەکان ئەوە دەردەخەن کەوا بڕێکی زۆر لە مادەی (سیتۆستیرۆڵ) هەیە لەپاڵ ڤیتامین C هەردووکیان گرنگن بۆ بەهێز کردنی موولوولە خوێنەکانی پووك (لثة). بەم جۆرە بڕی تەواوی خوێنی بۆ دەچێ. دیسان شیکردنەوەکان دەریان خستووە کە سیواك مادەی خوێن وەستێنی تێدایە ناهێڵێ پووك (پدوو) تووشی خوێن لێهاتن بێت. لەوانە مادەی (مازوو (عمض)) (ترشی تەنیك) ئەو مادەیە بەکاردێ بۆ وەستانی خوێنی ددان دوای هەڵکێشانی، هەروەك یارمەتی تیماری پدوو دەدات دوای جوینی خۆراك و پارچە کردنی کە ناهێڵێ خوێنی لێ بێ و برینە بچووکەکانی چاك دەکاتەوە. ئەوەی خۆشە لێرە باس کرێ ئەوەیە پزیشکانی ددان ڕاهاتوون لەسەر ئامۆژگاری کردنی ئەوانەی هەوکردنی پووکیان هەیە، پدوویان بە تێکەڵێك بشێلن کە پێکهاتووە لە (٢٠٪) ترشی تەنیك و (٨٠٪) گلیسرین، پێکهاتەیەکی بەسوودە بەڵام تامی توندو تیژەو ناحەزە. ئەمەو لە کاتێك هەمان ڕێژەی ترشی تەنیك لە سیواکدا هەیەو کار لە تامیشی ناکات. بەڵکو سیواك تامێکی هەیە لای زۆرێك لە خەڵکان خۆشەویستە. زاندراوە کە تامی سیواك هاندەرە بۆ

زێده ڕژانی لیکی دەم، هەروەك دەزانین دەم بڕی (١٠٠٠-١٥٠٠)سم[٣] لیك دەردەدا لە ماوەی ٢٤ سەعاتدا. بەردەوام دەردەدرێ بۆ تەڕ کردنەوەی ناو دەم‌و پاك کردنەوەی‌و بەرگری لێ کردنی‌و زێده کردنی جووڵەی ددان‌و قسە کردن.

فەرمانێك هەیە ئەویش پاککردنەوەی دەم‌و ددانە لەو بۆنە ناخۆشانەی جار بە جار تووشی دەبن بەهۆی پاك نەکردنەوەی‌و پشت گوێ خستنی، جا کاتێ پاشماوەکانی خواردن لە کەلێنی ددانەکان‌و ڕووی ددان کۆ دەبێتەوە یا لە بۆشایی کاکیلە کلۆرەکاندا، ملیۆنەها بەکتریا هان دەدا بۆ کارکردن‌و شیکردنەوەی مادەکان‌و بەرهەم هێنانی ترشە چەورەکان‌و کبریتۆزی ئایدرۆجین ئەوانەش مادەی بۆنداری بەهێزن وا لە دەم دەکەن بۆنی ناخۆش بێ، دەریش کەوتووە سیواك بڕی (١٪) مادەی بۆنداری ڕۆنی تێدایە کە بۆنی ناخۆشی دەم لادەباو بەو مادەیە بۆن خۆشیشی دەکا. جگە لەوانەی باسمان کرد سیواك مادەی (ئەنترالیتۆن)یشی تێدایە، یارمەتی تەواو خاوێن کردنەوەی دەم‌و ددان دەداو لە سەرەتای هەرس کردندا ئارەزووی خواردن دەکاتەوەو جووڵەی ڕیخۆڵەکان ڕێك دەخات. ئەوەی دوا جار توێژەران دۆزیویانەتەوە ئەوەیە سیواك کاریگەری هەیە دژی گرێ شێرپەنجەکان هەروەها جەختیان

کردەوە لەسەر هەبوونی مادەی ڕاگری خانە شێرپەنجەیی یەکان، بەردەوام توێژەران خەریکن بۆ دۆزینەوەی مادە سەرسوڕهێنەرەکانی سیواك کە بەردەوام خەڵکێکی زۆر پێیەوە سەرسوڕماون.

## بەکتریای دەم و هێزی زیندەیی سیواك:

دەبێ سیواك ڕۆڵێکی ڕاستەوخۆی هەبێ لە کوشتنی سوپاکانی بەکتریای دەم؟ پرسیارێکەو ئاسان دێتە بەر چاو، بەڵام وەڵامەکەی سەدەها توێژینەوەی ویستووە، ڕەنگە کێشەی سەرەکی لە دەمی خەڵکان دا بێ، چونکە بە ڕای توێژەران کۆشگرەیەکی نموونەیی یە بۆ گەشەو زۆر بوونی میکرۆبەکان. جا لە بۆشایی دەم جۆرەها بەکتریا هەن لە هاوسەنگیەکی سەسوڕهێنەردا، هەندێکیان ناتوانن واز لە هەوا بێنن، بەڵام هەندێکی تریان ژەهراوی دەبن بە هەبوونی ئۆکسجینی هەوا. سوپایەکی گەورەی بەکتریا ژمارەیان لە یەك میللیگرام ددانددا لە (٣٠٠) ملیۆن خانە زیاترە. هۆی نەخۆشی گەورەی ناو دەمن خەڵکان هیچی لێ نازانن بەڵام زانایان لە ترسناکیەکەیان تێ گەیشتوون. دەمێکە قۆڵیان لێ هەڵماڵیوەو سوورن لەسەر ڕووبەڕووبوونەوەی، هەویری ددانیان داهێناوە مادەی دژە

زیندەیی تێدابێ. کەچی بەخت یاوەری نەبوو چونکە پزیشکان زوو ناڕەزا بوون لێی دوای ئەوەی هاوسەنگی بەکتریای ناو دەمی تێکدا.

هەر ئەمە نا! بەڵکو بووە هۆی پەیدابوونی تۆرەمەی (سلالات) بەکتریای بەرگر بۆ ئەو مادانەو هۆشداری دەدا بە هەبوونی ئەو سیفەتە لە جۆرەکانی تری بەکتریاکان. هەویری دی دەرکەوتن بێ هەبوونی مادەی دژە زیندەیی (Antibyotic) بەڵام مادەی پاککەرەوەو بکوژی میکرۆبەکانی تێدایە، ئەوەشیان بووە هۆی هێرشی چینێك لە توێژەران لەوانە پرۆفیسۆری ئەڵمانی (فیستەر)، ئەوان ڕایان وایە کە هەبوونی مادەی پاککەرەوەو کوژەری میکرۆبەکان لە هەویرری ددان دەبێتە هۆی تێکچوونی هاوسەنگی ووردی زیندەیی ناو دەم کە ئەمەشیان دەبێ بەهۆی کلۆر بوونی ددان. ڕەنگە ئێستا هەندێك بپرسن: ئایا بگەڕێینەوە سەرەتا؟ ئایا چارەیەکی زانستی نیە تەنها بەکتریا زیان بەخشەکان بکوژێ‌و هاوسەنگی بەکتریاکانی تر بپارێزێ؟.

## سیواك ئەو چارەیەی پێیە؟:

بەڵێ لێرە ڕۆڵی سیواك دەردەکەوێ، لەم ڕووەوە بە جێگرەوەیەك (بدیل)ی نموونەیی دادەندرێ کە توێژەران لە دوای دەگەڕێن، شیکەرەوان مادەیەکی ئەندامی کبریتیان لە سیواکدا دۆزیەوە بە ناوی (سینگریت)، کە لە زمانی کیمیاگەراندا مادەیەکی گلیکۆزیدیە لە یەککگرتنی شلەڕۆنی خەردەل و (ألیل) شەکری گلوکۆزی ڕاستە پێك دێ. شلەڕۆنی خەردەلەکە مەبەستە، لەبەر ئەوەی بۆنێکی تیژو تامێکی سووتێنەرەوەی هەیەو توانایەکی بەهێزی پاککردنەوەی هەیەو بەهێزیشە بۆ کوشتنی میکرۆبەکان. بەگوێرەی ئەمە بەهای ڕاستەقینەی (سینگریت) لە هەبوونی ئەو شلە ڕۆنەیە ئەویش بەهۆی ئەنزیمی سروشتی ناو لیك (Myrosin) جیا دەبێتەوو بێ ئەو کاریگەری کوشتنی میکرۆبەکانی نابێ. هەروەك دەزانین هەموو دۆزینەوەیەکی زانستی ڕووداوێکی هەیە، چیرۆکی دۆزینەوەی قرکەرە زیندەیی یەکان بەهۆی سیواك بە کۆمەڵێك توێژەرەوەی ڕەسەن دەست پێ دەکا، کاتێ مادە دەوڵەمەندەکانی ناو سیواك سەرنجی ڕاکێشان، هەستان یەك یەك مادەکانیان لێ دەردەهێنا ئەوجا کاریگەری هەریەك لەو مادانەیان لەسەر کۆمەڵێ بەکتریا تاقی کردەوە بۆ گەیشتن بەو

مادەیەی میکرۆب کوژە. تۆژینەوەکە درێژەی کێشاو نەگەیشتن بە شتێکی وا کاریگەر بێ بەپێ ی پێویست، لێرە کەوتنە پرسیار، ئەگەر پلانەکەمان بگۆڕینو لە دوای پێکهاتەکانی سیواك بگەڕێین لە ناو لیکی مرۆڤدا، لە ناوەندە سروشتیەکەی خۆی. شتێکی کتوپڕ ڕووی دا، ماددەیەکیان لە لیکی مرۆڤدا دۆزیەوە کە پێشتر لە تاقیکردنەوەکانی تاقیگەیی سیواکدا دەستیان نەکەوتبوو، لێرە پرسیارێکی زیندەیی دروست بوو؟ ئەو پێکهاتانە لە کوێ هاتن؟ دوای چەند تاقیکردنەوەیەکی ورد دەرکەوت ئەو پێکهاتانە خۆیان هی سیواکن بەلام لەناو سیواکدا بە یەککرتوویی لەگەڵ مادەی تر کیمیایانە هەبوون نەیان دەهێشت ڕزگار بنو کاریگەریان دەرکەوێ، بەو شێوە هەر کە بواری بۆ ڕەخسا بەهۆی ئەنزیمی لیك لەو بەندە کیمیایی یە قورتار بوو کاری خۆی کردو هێرشی بردە سەر مۆلگە بەکتریاکان بەجۆرێك لەماوەیەکی پێوانەیی دا (٩٧٪)ی بەکتریا زیان بەخشەکانی لەبەین برد. هێشتا چیرۆکەکە کۆتایی نەهاتووە، ڕووداوێکی لەناکاوی تر هاتە پێش توێژەران دوای ئەوەی پەردەیان هەڵمالی لە ڕووی ئەو ڕۆڵە پێچەوانەیی یەی کە ئەنزیمەکانی لیك پێ ی هەڵدەستن بۆ پاراستنی مادە زیادەکە لە فەوتان. ئەگەر لە حالێکدا بڕی ئەو مادەیە زێتر بوو لە

پێویستی دەم، ئەوا ئەو زیادەیە دووبارە یەکدەگرێتەوە لەگەڵ مادەکانی تری دەم لەبن کاریگەری ئەنزیمی لیکدا لەو کاتە زیانی بۆ میکرۆبەکان نامێنێ. هەموو شتێك لێرە بە ئەندازەیە هەر کە ترشایی لیك گۆڕا بەهۆی جموجۆڵی میکرۆبی یەکسەر ئەنزیمی لیك چالاك دەبێو بەشێك لە مادەی کارا ئازاد دەکاو ئەویش بە خێرایی بەکتریا زیان بەخشەکان لەناو دەبا بە هاوسەنگیو لێزانی. ئەو سیناریۆیە لە ماوەی دوازدە کاتژمێردا چەند جار دووبارە دەبێتەوە. ئەمە ئەو ڕاستیەیە کە دەمانەوێ تێ ی بگەین، سا سیواك تەنها پاك کەرەوە نیە بۆ ددان بەڵکو پاککەرەوەیەکی زیندەیی بەردەوامە. بەمەش لە هەموو هەویرەکانی ددان جیایە کە توێژەرەوان بە پاك کەرەوەی کاتی دادەنێن چونکە دوای (٢٠) خولەك ئاستی میکرۆبی دەگەڕێتەوە دۆخی جارانی ئێستا هەر دەبێ ڕاستی بڵاو کەینەوە، نابێ بڕوا بکەی کە هیچ یەك لە هەویرەکانی ددان فەرمانێکی چارەسەری هەبێ بۆ هیچ نەخۆشیەکی دەمو ددان، لە ڕاستیدا فەرمانی هەویری ددان (لە زۆربەی جۆرەکانیدا) لە ئاسان کردنی جووڵەو هاتوچۆی فڵچەی ددان بۆ پاککردنەوە پتر نیە تا لە ئەنجامی لێك خشاندا زیان بە دەمو ددان نەگات. هەتا ئەو هەویرانەش بەو دوایی یانە کە مادەکانی فلۆرایدو ڕێگری بۆگەن بوونو

کوژەری میکرۆبەکانیان بۆ زیادە کردوون بە گوێرەی پێویست سەلامەتی دەمو ددانی نەپاراستووە هەروەك هاوسەنگی بزیندەیی لەناو دەمدا ڕانەگرتووە. لەو شتانەی باسمان کرد دەگەینە ئەوەی جیاوازیەکی جەوهەری هەیە لە نێوانی سیواكو هەویری دداندا، لەو کاتەی زیانی هەویری ددان دەردەکەوێ هێزی هاوسەنگیو سوودە تەندروستیەکانی سیواك زیاتر دەبن.

بەڵێ بەڕاستی شتێکی سەرسوڕهێنەرە گوێمان لە پیاوانێك دەبێ لە پسپۆڕانی ئەو بوارە مەسەلەکە دەڕازێننەوە لە یەك دێرداو دەڵێن: (ئێمە قەناعەتی تەواومان هەیە بە چاکتر بوونو سەرکەوتنی سیواك بەسەر هەموو پاککەرەوەکانی دەمدا) پاکی بۆ تۆ ئەی خوایە! دوای چواردە سەدە لە گوتنی فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی سیواكو لە وەختی پزیشکایەتی ناوکیو لە چاخی تەکنەلۆجیای پێشکەوتوو کە شتی ئاوای داهێناوە بە خەیاڵی کەسدا نەدەهات هێشتا سیواك لە پێشەو بەردەوام موعجیزاتەکانی ڕۆژ بە ڕۆژ دەتەقنەوەو موعجیزەی پزیشکیو تەندروستین. کەسیش لە سەردەمی پێغەمبەر ئەو شتانەی نەدەزانی، جا کێ بە (محمد)ی ڕاگەیاند، لە کاتێك نە خوێندەواری هەبووەو نە ژمێریاریش هەبووە، بەڕاستی ئەوە

سوێند بە خوا موعجیزەیەکی ئەمرو نوێ گەرایە لە ئاسمانەوە دابەزیوە لەسەر زمانی دوا پێغەمبەردا.[1]

**چواردەهەم:**

**سیواك لە دیدی زاناکانی ڕۆژئاوادا:**

توێژەری ئەڵمانی (ڕۆدات) بەڕێوەبەری پەیمانگای مایکرۆبایولۆجیاو نەخۆشیەکان لە زانکۆی (ڕۆستۆك)ی ئەڵمانی تاقیکردنەوەیەکی سەرسوڕهێنەری کرد تیایدا پێمان دەڵێ: (جارێکیان کتێبێکم خوێندەوە هی ڕێبوارێکی گەڕیدەی ئەورووپی بوو باس لە سەفەرو بینینەکانی دەکا لە وڵاتە عەرەبیو ئیسلامیەکاندا، گاڵتە پێ کردنەکەی بە خەڵکی ئەو وڵاتانە کە لە سەدەی بیست ددانیان بە پارچە دارێك پاك دەکەونەوە پێ ی دەڵێن سیواك، سەرنجی ڕاکێشام بە پێچەوانەی ئەو شێوازی گاڵتەجاڕیو بریندار کەرە لەناکاو پرسیارێك بە خەیاڵمدا هات: دەبێ لە پشت ئەو پارچە دارە ڕاستیەکی زانستی ڕۆشن نەبێ؟ زۆر ئاواتەخواز بووم توێژینەوەی زانستیو لێکۆڵینەوە بکرێ

---

[1] لە وتاری دکتۆر (فوزی عبدالقادر فیشاوی)، مامۆستا لە کۆلێژی کشتوکاڵی زانکۆی ئەسیوت لە گۆڤاری (منهل)ی مانگی ڕەمەزان (١٤١٧)ی کۆچی کانونی دووەمی (١٩٩٧)ی زایینی.

لەسەر فلْچەی ددانی عەرەبی (سیواك). خۆشبەختانە زۆری نەبرد ئاواتەکەم هاتە جێ. فرسەتێکم دەست دەکەوت تا سیواك بپشکنم‌و خستمە ژێر زنجیرە تاقیکردنەوەیەکی کیمیایی‌و مایکرۆبایۆلۆجی، ئەمڕۆش تەنها ئەوەم بۆ ماوەتەوە دان بنێم بە بەها تەندروستی‌و سەرکەوتوویی یەکەی، بەڵکو لە بەرزترین هۆیەکانی پاك کردنەوەی ددانی حسێب دەکەم.

ئەمەش تاقیکردنەوەکانی منە دەیسەلمێنن کە سیواك مادەی بکوژی میکرۆبی تێدایە وەك مادەی (پەنسلین) وایە.

با جگە لە زانای ئەڵمانی بخوێنینەوە، هەندێك لە زانکۆی (منیسۆتای ئەمریکی) لێکۆڵینەوەیەکی ڕووپێویان کرد لەسەر باری تەندروستی کۆمەڵێك دەمی موسڵمانە زنجیەکان (ڕەش پێستەکان) دەرکەوت ئەوانەی کەوا سیواك بەکاردەهێنن ددان‌و پووك (پدوو)یان سەلامەتە بە بەراورد لەگەڵ ئەوانەی فلْچەو هەویری ددان بەکاردەهێنن. شایەدێکی دی هەر لە خۆیانەوە توێژەری پزیشکی (کینث کیودیل) لە کۆنگرەی پەنجاو دووەمین ی کۆمەڵەی نێودەوڵەتی بۆ توێژینەوەی ددان لە ئەتلانتای ئەمریکی ڕادەوەستی‌و بە ئاشکرا دەڵێ: چەند تاقیکردنەوەیەکی زانستی دەیسەلمێنێ کە بواری گومان کردن

ناهێڵێ کەوا سیواک مادەی وەهای تێدایە ڕێگرە لە کلۆربوونی ددان. هەروەها لێکۆڵینەوەکان دەری دەخەن کە سیواک بەکارهێنەکان ددانێکی تەندروست و پتەویان هەیە. ئەوەش وای کرد زۆرێك لە کۆمپانیاکانی بەرهەمهێنی هەویری ددان هان بدا بۆ تێکردنی پوختەی سیواکی سروشتی لە هەویرەکانیاندا هەروەك ئێستا لە ڕێکلامەکانی تەلەفزیۆنەکان دەیبینین.

ئەوانە شایەدی هەندێ لە توێژەرانی پسپۆڕی ئەو بوارەن و هێشتاش شایەدی تر زۆرن لە دوی یەك دێن و بەردەوام موعجیزەی سیواک لە دلی کارگەکانی لێکۆڵینەوە بەدوای یەکدا دێن.[١]

خوداش زاناترە

[١] بگەڕێوە بۆ گۆڤاری (المنهل)ی دەرچوو لە مانگی ڕەمەزانی پیرۆزی سالی (١٤١٧)ی ك بەرامبەر کانونی دووەمی (١٩٩٧).

# ناوەڕۆك